دیوانی

# ئەسیری

ئامادەکردن و پێشەکی

**د. کوردستان موکریانی**

پێداچوونەوە و بەراورد:

**ئەحمەد تاقانە**



ناوی کتێب: دیوانی ئەسیری
ئامادەکردن و پێشەکی: د. کوردستان موکریانی
پێداچوونەوە و بەراورد: ئەحمەد تاقانە
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٧٧
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: جەلال ئەلیاس
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٥٢٠)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

## وتەیەکی پێویست

یەکێک لەو کارانەی کە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ساڵانێکە گرتوویەتییە ئەستۆ، چاپکردنەوەیەکی ورد و تێروتەسەلی دیوانی شاعیر «ئەسیری»یە. ئەسیری، یەکێکە لەو شاعیرانەی چەند جارێک دیوانی لە چاپ دراوە و لێکۆڵینەوەی لە بارەوە نووسراوە؛ بەڵام وێڕای ئەوەش کەموکورتی بەسەرجەم دیوانەکەیەوە دەبینرێ.

د. کوردستان موکریانی، دەفتەرێکی دەستنووسی خستە بەردەستی دەزگای ئاراس کە ژمارەیەکی زۆر لە شیعرەکانی ئەسیریی بەدەسخەت تێدا نووسرا بووە و ئەم دیوانە وەک دەردەکەوێ، ئەسیری کاتی خۆی پێشکێش بەگیو موکریانیی کردووە بۆ ئەوەی لە چاپخانەکەی خۆیدا لە چاپی بدات.

سەرەتا، هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی ئەم دیوانەمان سپاردە نووسەر عەزیز حەریری. پاش تاوتوێ کردن و بەراورد دەرکەوت، کارەکە نیوەچڵە؛ بۆیە کارەکەمان هێشتەوە تا پاش چەند ساڵێک ڕوومان لە نووسەر ئەحمەد تاقانە نا بۆ ئەوەی هەم بەسەرتاپێی کارەکە بچێتەوە و هەمیش بەراوردی بکات لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکانی پێشووی ئەسیریدا.

ئەحمەد تاقانە، عاشقانە کەوتە دوای ڕاپەڕاندنی ئەم کارە و زۆریشی پێوە ماندوو بوو. چەند مانگ، بەوردی کاری لەم دیوانەدا کرد و ئەوەی پێشکێش دەکرێت ڕەنج و ماندووبوونی بێ وێنەی ئەوانی پێوەیە.

دەزگای ئاراس لە کاتێکدا کە شانازی بەم کارەوە دەکات، ئەوەشی لە



بیر ناچێ کە سوپاسی بێ ڕادەی بەدەنگەوە هاتن و هاوکاریی بەڕێز د. کوردستان و ئەحمەد تاقانە و سەرجەم ئەو برا بەڕێزانە بکات کە لەم دیوانەدا ئەرکیان کێشاوە بەتایبەتی عەزیز حەریری و شێرزاد فەقێ ئیسماعیل و ژمارەیەک لە کارمەندانی دەزگای ئاراس. کاری پێکەوەیی هەمیشە کامڵتر و بەرچاوترە لە کاری تاکە کەس. دیوانی ئەسیری نموونەیەکە بۆ ئەم بنەمایە. د. کوردستان موکریانی کارێکی گرینگی ئەنجام دا کە سەرپەرشتیی ئەم پرۆژە شایانەی گرتە ئەستۆ، بەمەش گەلێک تەمومژی ناڕەوای ڕەواندەوە. دەزگای ئاراس – هەولێر ١٢ حوزەیران ٢٠٠٦

## کاری من لەم دیوانەدا

دەزگای ئاراس–ی فرە بەرهەم و ئاست بەرزی هونەری و زانستی، بەسوپاسەوە، ڕوویان لێنام، منیش (وەک کەرکووکییەک) بەشداری لە کارگوزارییەکانی ئامادەکردنی دیوانی (ئەسیری)ی نیشتیمانپەروەری ناسراوی کەرکووکیدا بکەم، ئەوەبوو بەسوپاسەوە بەدەنگیانەوە هاتم، کارەکەی منیش بەمجۆرە بوو: پێشتر دەستنووسەکەی شاعیر کە خۆی داویەتیە لای مامۆستا گیوی موکریانی–ی خوالێخۆشبووی نەمر، کاری لەسەر کرابوو... بەڕێنووسی تازە نووسرابووەوە و کۆمپیوتەر و هەڵگری کرابوو... من لێرەوە هاتمە ناو کارەکەوە... بەراوردێکی دیکەی وردی دەستنووسەکە و چاپکراوەکەم کردەوە و یەک دوو جاری دیکەش هەڵەگریم ئەنجام دا.

لە دەستنووسەکەدا هەندێک وشە و دێڕ و نیوە دێڕ دەستکاری کرابوو یان هێڵیان بەسەردا کێشرابوو بۆ ئەوەی لابرێن... ئەوانەم هەموو دانایەوە و لە پەڕاوێزەکاندا ئاماژەم بۆ هەر هەموو ئەوانە کرد... هەرچییەکیش لەبەر کێش و واتاکەی... (من خۆم) دەستکاریم کردوون کە زۆر دەگمەنن، ئەوانەشم لە

پەراوێزدا ئاماژە بۆ کردوون.

هەندێک وشە، زۆر بەپێویستم زانیوە واتایان لێک بدەمەوە، بەکورتی لە پەراوێزەکاندا دامناون.

هەروەها هەندێک لێکدانەوەی (ژماردن)ی دێڕ یا ڕستەی بەپێی پیتی ئەبجەدی کە لە دەستنووسەکەدا نەبوو لێکم داونەتەوە و بەهیجری (کۆچی) و بەزایینی مێژووەکانم داناوە.

هەروەها بەراوردێکی شیعرەکانی دەستنووسەکەی مامۆستا (گیو) و دوو بەرگە دیوانەکەی کە لەلایەن مامۆستای هێژا (مستەفا عەسکەری)یەوە چاپکراون، کردووە و هەر جیاوازییەکم لە نێوانیاندا بەرەچاو کەوتووە، شوێن و لاپەڕەکانیان لە چاپەکاندا، لە پەراوێزدا دەستنیشانم کردوون و ئاماژەم بۆ کردوون.

ئینجا دیوانەکەم سەرلەنوێ بەپێی ڕیز بەندیی سەرواکانیان ڕێزکردووەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر هەر شیعرێکی ویست لەو پێڕستەدا کە بۆی ڕێکخراوە بەپێی ڕیزبەندیی سەرواکانیان بەزوویی دەستیان بخات و... هەر وەکو لە ئامادەکردنی دیوانە شێوە کلاسییەکاندا باوە. هیوادارم کارێکی باشم کردبێ. ئەحمەد تاقانە – کەرکووک.

# پێشەکی

سەرەتای ئەم پێشەکییە بەگێڕانەوەی چیرۆکێک دەست پێ دەکەم، کە هێندێک جار بەنارەوا بۆمان هەڵ دەبەسترێت و بنەماڵەی ئێمە دووچاری دەبێت؛ ئەویش لە ئەنجامی پاراستنی ئەو سامانە دەوڵەمەندەی بەرهەمی بیری نووسەرانی کوردە، کە لەکاتی خۆیدا حوزنی مامم و گیوی باوکم کۆیان کردۆتەوە.

ڕەنگە لە دەستپێکدا ئەو باسەی لەم شوێنەدا بۆتانی دەگێڕمەوە، تۆزێک نامۆ بێت؛ بەڵام دواتر بەندیواری بەو دیوانەوە ڕوون دەبێتەوە.

بەڕێز مستەفا عەسکەری لەساڵانی **١٩٨٧**[١] و **٢٠٠٠**[٢] دا بەرگی یەکەم و دووەمی دیوانی ئەسیری لەچاپ دا و دەستخۆشی لێدەکەم، بەڵام لەڕووی ئەوەی لە پێشەکی هەردوو کتێبەکەیدا لەو دیوانەی بەردەست و لەبەهەشتی گیوی موکریانی باوکم و من بەجۆرێک دواوە، پێویستی بەڕوونکردنەوەی هەیە؛ جا بۆ ئەوەی بابەتەکە ئاشکراتر و سوودبەخشتر بێت، وام بەباش زانی کە ئەو لایەنانەی لەپێشەکی هەردوو دیوانەکەدا بەندیواری بەئێمەوە هەیە هەروەکو خۆی بخەمە ڕوو:

*لەپاش چەند ساڵێک، کە لەماڵی خاڵۆم پرسی، بۆم دەرکەوت کەوا دوای ئەسیری- خوا لێ خۆش بوو- ڕەشید سیدقی، دیوانەکەی بردۆتە لای*

(١)مستەفا عەسکەری. دیوانی ئەسیری. بەرگی یەکەم. بەغدا ١٩٨٧

(٢)مستەفا عەسکەری. دیوانی ئەسیری. بەرگی دووەم (؟) ٢٠٠٠.



*مامۆستا گیوی موکریانی- کە دۆستێکی گیانی بەگیانی ئەسیری بوو لە ژیانیدا- بەنیازی چاپکردنی. ئێمەش، کەس و خزمی ئەسیری بەتەمای لە چاپدانی دیوانەکەی ساڵانێکی زۆر چاوەڕێمان کرد. پاشان هەوڵماندا دیوانەکە وەرگرینەوە؛ بەڵام بێ سوود بوو، مامۆستا موکریانی خۆی بەدەستەوە نەدا.*

*لەدوای کۆچی موکریانی هەوڵێکی زۆرمان لەگەڵ دکتۆر کوردستان موکریانی دا، من خۆم چەند جارێک چوومە لای، ئەم هەوڵەش بێ سوود بوو، بە هەر مەرجێک بێ توانیم چەند شیعرێکی «ئەسیری»ی لە کەشکۆڵێکی موکریانیدا بوون- لەدکتۆر کوردستان وەربگرمەوە. ئەوەی جێی داخە مامۆستا گیو و دکتۆر کوردستان دانیان دەوە دانا کە دیوانەکەیان لا یە، بەڵام بیانوویان دەهێنایەوە بۆ نەدانەوەی، لەم دواییەدا چوومەوە لای دکتۆر کوردستان بۆ داواکردنەوەی دیوانەکە. لەوەڵامدا دکتۆر دەڵێ «لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کتێبی تردا فەوتاوە».*

*لەڕاستیدا شیعری ئەسیری گەلێک لەوە پترن، کە لەم دیوانەدا بۆمان کۆکراوەتەوە. کۆمەڵە شیعرێکی زۆری هەیە کە دەستی ئێمەیان پێنەگەیشتووە و نەمانتوانیوە چاپیان بکەین؛ بەتایبەتی لەبەر ئەوەی دەستنووسەکەی ئەسیری خۆی لەکتێبخانەکەی مامۆستا موکریانیدا بەندەو بە کەفالەتیش بەرەڵا ناکرێ؛ یان لەبەر هەندێ هۆی تر.*

*... خوالێخۆش بوو گیو موکریانی بەداگیرکردنی دەستنووسەکەی ئەسیری، کارێکی وای کرد کە هیچ کەسێک خۆی لە بواری دیوانی ئەسیری نەدا. (مستەفا عەسکەری **١٩٨٧**).*

لەپێشەکی بەرگی دووەمی دیوانی ئەسیری دا مستەفا عەسکەری هەر لە بارەی هەمان بابەتی لە ژووروو باسکراودا دەڵێت:

*گەر دەستنووسەکەی «ئەسیری»مان دەست بکەوتایەوە- کە کەوتۆتە لای*

*بنەماڵەی گیو موکریانی ئەم هەموو لەسەر نووسین و پاکانە و چەندوچوونەی نەدەویست. بەڵام ئەوەی جێی داخە د.کوردستان موکریانی سەرەڕای ئەوەی دەستنووسەکەشی بۆ ئێمە نەناردووە، بۆنی گلەییش لەدەمی دێ. وابزانم هەندێ شتی وا هەیە کە دکتۆر خۆی دەزانێ و منیش باسم نەکردوون؛ دەبوو هۆی ئەوە بێ دکتۆریش لەسەری نەڕوا. باڵێرەدا کۆتای بێ.*

*هەر لەبەرگی دووەمدا نامەیەکی کەمال ڕەئووف محەمەد بڵاوکراوەتەوە، تێیدا وا باسی ئێمە دەکات:*

*...بووژانەوەی «ئەسیری» لەم ڕۆژگارەدا بەپێی دەرفەتی، زۆر بەکەڵک بوو؛ ئەگەرچی هیوام زۆر بوو هەموو شیعرەکانی بووایە، بەڵام خۆت وتەنی، کچەکەی گیوی مەرحووم، دیوانەکەیان بەندکردووە و بەکەفالەت بەرەڵای ناکەن. (مستەفا عەسکەری ٢٠٠٠)*

پێوەندی ئەسیری بەبنەماڵەی ئێمەوە بۆ ساڵی ١٩٢٦ز. دەگەڕێتەوە؛ بۆ سەردەمێک، کە هێژ مستەفا عەسکەری نەهاتبووە دنیا. لەو کاتەدا حوزنی موکریانی بەدەیان هۆنراوەی نیشتمانی ئەسیری لە کۆڤاری زاری کرمانجی (١٩٢٦-١٩٣٢)دا دواتر گیوی باوکم لە گۆڤاری هەتاو(١٩٥٤-١٩٦١) بڵاوکردۆتەوە؛ یانی بنەماڵەی ئێمە ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەبووە لە ناساندنی هۆنراوەکانی ئەسیری بەکورد و پاراستنی لە نەمان. بەڵام لەبەر ئەوەی مستەفا عەسکەری لەم بوارەدا نامۆیە، بەڵگەشم بۆ نەشارەزایی مستەفا عەسکەری لەدنیای پاک و بێگەردی وێژەدا، ئەو وشە یاساییانەیە کە بەرامبەر بەتاوانبارێک بەکاردێت، کەچی ئەو بەرامبەر من و باوکم بەکاری هێناوە؛ وەک: خۆ بەدەستەوەدان، بەندبوون، کەفالەت. بەرەڵاکردن، داگیرکردن ، دان پێدانان، بیانووهێنانەوە و... من لە مستەفا عەسکەری ناگرم؛ چونکە زانیاری گشتی لەیاسا تێنەپەڕیوە و هەموو کەسێک لای ئەو تاوانبارە.



مرۆڤی ئاواش لەدنیای ناسکی شیعر ناگات و نرخی ئەو ڕاژە نازانێت، کە خانەوادەی ئێمە لە بواری بیری کوردایەتیدا پێشکێشی کوردمان کردووە.

مستەفا عەسکەری چەند جارێک وشەی «وەرگرتنەوە، گەڕاندنەوە» بەکاردێنێت؛ من نەک پەڕێک بەڵکو تاکە پەیڤێکم لەو وەرنەگرتووە تا بۆی بگەڕێنمەوە. گیوی موکریانیش هەر دەستنووسێکی مافی ئەوەی نییە، لێی وەربگرێتەوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتی دەیان وەک مستەفا عەسکەریمان داوە، بۆ ئەوەی سوود لەو دەستنووسانە وەربگرن، کە ئێمە لە نەمان ڕزگارمان کردوون.

لەکۆتایی ساڵانی هەفتای سەدەی ڕابوردوودا لەلایەن ڕژێمی بەغداوە، بڕیارێک لە بارەی ئەو دەستنووس و بەڵگەنامانە دەرچوو، کە لە ماڵان پارێزراون؛ تێیدا داوا لە خاوەنەکانیان دەکات، کە دۆکومێنتەکان بە بنکەی بەڵگەنامەی بەغدا بسپێرن و وێنەیەک لەو نامەیە ئاراستەی ماڵی ئێمە کراو داوامان لێکرا، کە بەزووترین کات داخوازەکەیان بهێنینە دی.

ئێمە هەردەم ئارەزووی ئەوەمان کردووە، کە لایەنێکی ڕۆشنبیری باوەڕپێکراو هەبێت، ئەو دەستنووسانەمان لەخۆی بگرێت و بەشێوەیەکی هاوچەرخانە بیانپارێزێت؛ تا سوودبەخشترین؛ چونکە سامانێکی نەتەوەیی بەنرخی بیری کوردە. بەڵام هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبووین، کە بەڕژێمی بەغدای بسپێرین و ئەویش بەمەبەست لەنێویان بەرێت. هەر لەو ڕوانگەوە، لەدوای ئەو بڕیارەی بەغدا ماڵەوەمان خێرا هەرچی دەستنووسی بەنرخ هەبوو، بەبێ ئەوەی لیستێکی بۆ بکەن وەیا هەتا بیانژمێرن بەسەر چەند ماڵێکی گومان لێنەکراودا دابەش کرد؛ تاوەکو لای خۆیان تا ماوەیەک بیپارێزن.

لەو زەمانەدا بوو، کە بەڕێز مستەفا عەسکەری پێوەندی پێوە کردم و باسی ئەو دەستنووسەی بەردەست و نیازی چاپکردنی کرد. منیش بەبێ

ئەوەی باری ئەو دەستنووسانەی بۆ ڕوونبکەمەوە، تکام لێ کرد کە مۆڵەتم بداتێ، تا هەوڵبدەم بۆی پەیدابکەم. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی دی من لە زانکۆی سلێمانی کارم دەکرد و دەستنووسەکانیش لە هەولێردا بەسەر ماڵاندا پەرشو بڵاو کرابوون.

مستەفا عەسکەری لەبەرگی دووەمی دیوانی ئەسیریدا دەڵێت: بەڵام ئەوەی جێی داخە د.کوردستان موکریانی سەرەڕای ئەوەی دەستنووسەکەشی بۆ ئێمە نەناردەوە، بۆنی گلەیش  لەدەمی دێ. وابزانم هەندێ شتی وا هەیە کە دکتۆر خۆی دەیزانێ و منیش باسم نەکردوون. ئەبوو هۆی ئەوە بێ دکتۆریش لەسەری نەڕوا. بالێرەدا کۆتای بێ.

لێرەدا دەمەوێت ئەو شتە باس بکەم، کە ئەو نەیویستووە باسی بکات:

لەسەرەتای دامەزراندنمدا لە زانکۆی سلێمانی(١٩٧٧) دووچاری گیروگرفتی خانوو پەیداکردن بووم، کرێی مانگانەی خانوویەکی زۆر ئاسایی، لەمووچەی مانگانەکەم زێتر بوو. هەر بۆیە دایک و خوشک و براکانم خانوویەکی خنجیلانەی لەگەڕەکی ئیسکانی نزیک زانکۆی سلێمانی کڕی، تاوەکو من لەو کێشەیە ڕزگارم بێت. لە کاتێکدا دەبا زانکۆ ئەو گیروگرفتەی بۆ چارەسەر کردبام و نەک هەر ئەوە، بەڵکو وەکو هەر مامۆستایەک داوای پارچە زەویەکم کرد؛ لە وەڵامی لیژنەی زانکۆدا- کەبە سەرۆکایەتی د.فەرهاد محەمەد ئەمین بوو- کە من لەدایکبووی هەولێرم پێویستە لەوێدا داوای زەوی بکەم. کەچی ئەوەندەی من ئاگادارم د.عامر الدهان لەدوای من بەچەند مانگێک لە زانکۆی سلێمانی دامەزرا، خێرا خانوویەکی زانکۆیان پێشکێش کرد و هەر هەمان لیژنەی ئەو خواستەی منی نەپەژراند و پارچە زەوییەکیان بۆ دکتۆری نێوبراو و دەیان مامۆستای دی، کە دوای ئەو هاتن، تەرخان کرد.

لەپایزی ساڵی ١٩٨١دا زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێر گوێزرایەوە؛ منیش



گەڕامەوە هەولێر. بەپێی ئەو مافەی کە ماڵەوە بەمنیان بەخشی، ئەو خانووەی سلێمانی بەڕێگەی تەلەفۆنی نێوان من و د.محەمەد نوری عارف بەماڵی ئەحمەد محەمەد ئەمین قادر، زاوای کەمال ڕەئووف، بەبێ هیچ گرێبەستێک بەمانگانەی ١٠٠(سەد) دیناری بە کرێ دا. کرێی چەند مانگێک نەدرا بەبیانووی ئەوەی شووشەی پەنجەرە شکاوەکانیان چاککردۆتەوە و دواتر مانگانە ٦٠ دیناریان بەدەستی ساسانی کوڕی نەسرین خانی دراوسێ سلێمانیمان- کە لە زانکۆی سەلاحەددین خوێندکار بوو- بۆی دەناردینە هەولێر.

لەپایزی ساڵی ١٩٨٢دا بەفەرمانی دیوانی سەرکردایەتی شۆڕشی ڕژێمی بەغدا، کۆمەڵێک لە مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەددین لە کوردستان دوورخرانەوە و من و دکتۆر جەمالی هاوسەریشم بەرکەوتین؛ من بۆ وەزارەتی ڕۆشەنبیری و ڕاگەیاندنی بەغدا و ئەویش بۆ زانکۆی بەسرا. مانگانەی من لە ٣٦٠ (سێ سەد و شەست) دینارەوە بوو بە ١٠٥(سەد و پێنج دینار)، د.جەمالیش بەبێ مووچە مایەوە؛ چونکە نەیپەژراند بچێتە بەسرا، هەر لەبەغدا لەگەڵ من لەهوتێل مایەوە، کە شەوی بە ٧ حەوت دینار بوو. لەبەر باری نالەباری ئابووریم دایک و خوشکەکانم بڕیاریان دا کە کرێی خانووی سلێمانی، من وەریبگرم؛ تا ئاتاجی کەس نەبین. کەچی لە ٢٨ / ٤ / ١٩٨٣دا لەسەر داواکاری ئەحمەد محەمەد ئەمینی کرێچی، نووسراوێک بەناوی ئاگاداری ژمارە ٢٩٢٢٧م لەلایەن دایرەی کاتبی عەدلی سلێمانی بەدەست گەیشت، تێیدا داوام لێ دەکات، کە لەماوەی ١٥ڕۆژدا ڕووبکەمە سلێمانی بۆ وەرگرتنی ٤٠ دیناری کرێی خانووی باسکراو. هەڵبەت لەبەر ڕۆشنایی ئەو گرێبەستەی کە لەنێوان من و کرێچیدا مۆرکراوە، منیش ئەو ئاگادارییەم مۆر نەکرد و هەر بە ڕێگەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیدا- کە فەرمانبەربووم تێدا- نامەیەکم لە ١٧ / ٥ / ١٩٨٣دا ئاراستە کردن و ئەوەم تێدا ڕوونکردەوە،

که من ئەو کرێچییەم نەدیوە  و هیچ کەسێکیش لە بنەماڵەی ئێمە هیچ جۆرە گرێبەستێکی لەگەڵدا مۆر نەکردووە.

لەبەر ئەو ڕەفتارەی ناڕاستانەی کرێچییەکە، ماڵەوەمان بڕیاری بەتاڵکردنی خانووەکەیان دا، تا بیفرۆشن و خۆیان لەو سەر ئێشەیە ڕزگار بکەن و ڕاپەڕاندنی کارەکەشیان بە پارێزەر بەهەشتی نەزمی شاکر سپارد. لەگەڵ ئەوەی دۆخەکە لەبەرژەوەندی ئێمەدا بوو، کەچی دادگەی سلێمانی هەر لایەنگری ئەحمەد بوو؛ منیش بۆ زانینی ڕاستی ڕووداو ڕووم کردە سلێمانی. لەوێدا بۆم دەرکەوت کە مستەفا عەسکەری بووە بەپارێزەی ئەحمەد، لەدڵەوە نیگەران بووم، بەوەی هەر حکوومەتی بەغدا نانم نابڕێت، بەڵکو کوردیش دەمخاتە باری نەبوونییەوە. من ئەو نان بڕینەی بەغدام زۆر لا ئاسایی بوو؛ چونکە لەپێناوی کوردا بوو، بۆیە سەرفراز بووم پێی. بەڵام ئەوەی ئەحمەد و مستەفا عەسکەری نوواندییان لام گرانبوو؛ بۆیە ڕووی گلەییم لە مستەفا عەسکەری کرد، کە چۆن ئەو پشتگیری لە کارێک دەکات هەر لەبنەڕەتەوە دۆڕاوە؟ لەوەڵامدا وتی: من بەڵێنی ئەوەت دەدەمێ، کە ئەحمەد محەمەد ئەمین لەو خانووە دەربکەم، بە مەرجێک دەستنووسەکەی ئەسیریم بۆ پەیدا بکەیت.

بۆ ئەم پێشنیازەی مستەفا عەسکەری، ڕووم کردە هەولێر و داخوازەکەی ئەوم خستە بەردەم ماڵەوەمان. لەگەڵ ئەوەی ئەو هەڵوێستەی مستەفا عەسکەری بەرامبەر بە ئەحمەد بۆ هۆی گومانی گفتەکانی، ماڵەوەمان وایان پێ باش بوو، کە ئەم هەلەیش تاقی بکەنەوە؛ بۆیە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ٤٤ (چل و چوار) لاپەڕەی دەستنووس، هەموویان هۆنراوەی ئەسیری بوون بۆیان ئامادەکردم و گوتیان: هەرچەندی لەو دەستنووسەی ئەسیری گەڕاین نەمان دۆزییەوە و دوور نییە، هێندێک لەو ماڵانە لە ترسان لەگەڵ چەند بەرهەمی دیدا سووتاندبێتیان؛ هەروەک زۆر جاری دی.

لە ٢٠ / ٣ / ١٩٨٤دا لە کەرکووکدا لە ماڵی باپیری منداڵەکانمدا هەر



چل و چوار لاپەڕەکەم دا بەدەستی مستەفا عەسکەری، بەو هیوایەی لەدوای سوود لێوەرگرتن، لە ماوەی دوو هەفتەدا بۆمی بگەڕێنێتەوە؛ کەچی لەدوای ساڵ و نیوێک بەدەستی دکتۆر عەلی عەسکەری خزمی لەبەغدا بۆی گەڕاندمەوە. مستەفا عەسکەری هەرگیز نەیدەتوانی دیوانی ئەسیری چاپ بکات، گەر من ئەو ٤٤ لاپەڕەیەم بۆ نەبردبا! کەچی لە پێشەکی دیوانەکەدا لە برێتی ئەوەی سوپاسم ئاراستە بکات و لەو یارمەتیدانە بدوێت، وەک دەبینن هەر زاراوەی یاسایی ئەوانەی بەتاوانباران دەگوترێن بەدیاری پێشکێشم دەکات(*) مەرج نییە، هەر دەستنووسێکی کەوتە بەردەست  گیوی موکریانی چاپی بکات. ڕۆژێک لەڕۆژان چ دەسەڵاتدار، سەرمایەدار وەیا ڕۆشنبیرێکی کورد دەستی یارمەتی ماکی یان میناکی بۆ گیو درێژ کردووە؟ مستەفا عەسکەری چ قەرزێکی بەسەر گیوەوە هەیە بۆ ئەوەی گیو خۆی بدات بەدەستەوە. وا دیارە ئاوارەبوون و هەترەشەبوونی گیوی و بەندیخانەکانی مەهاباد، تەورێز، هەولێر، موسەیەب، حلەو کوت، کە لە ئەنجامی ڕاژەکردنی وشەی ڕەسەنی کوردیدا دووچاری بووبوو بەس نییە، مستەفا عەسکەری دەیەوێت خۆی بەدەست ئەوەوەش بدات؟ کوردێک دەیان دیوانی شاعیرانی وەک: مەلای جەزیری، ئەحمەدی خانی، وەفایی، ئەدەب، ئەدیب، حاجی قادر، سالم، کوردی، نالی، دڵدارو ...ساخکردبێتەوە، هەموو تەمەنی بۆ دانانی فەرهەنگ و چاپکردنی بەسەر بردبێت، بۆ ماوەی حەوت ساڵ گۆڤاری هەتاو پەخشکردنی و بەدەیان کاری تر بەس نییە؟ گیوی موکریانی، کە هەموو ژیانی بۆ کورد ژیا، گەر هاتبا بەو شاکارانەی ئەنجامی داوە لەنێو

(*) مستەفا عەسکەری گفتی خۆی نەهێنا دی، بەوەی ئەحمەدی کرێچی لەنێو خانووەکە دەربهێنێت. ئەحمەد شوقەیەکی بۆ دەرچوو بوو، کەچی هەر دەیویست پارەیەکی باشم لێوەربگرێت، جا خانووەکەی چۆڵ بکات؛ بەڵام من بەهێزی یاسا پێم چۆڵ کرد.

هەر میللەتێکی دی بووبایە، پلەو ڕێزو پایەیەکی دی دەبوو. گیو موکریانی هەتا ئەو کارە مەزنانەشی نەکردبا ئەوەندی بەسە کە بەهەزاران لاپەڕەی دەستنووس لەفەوتان ڕزگار کردووە؛ وەک منداڵەکانی لەدەست دوژمنانی کورد پاراستوونی، لە کاتێکدا کە خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی ڕەواجی نەبووە و زۆر جاریش هەر قەدەغە بووە.



## ئەسیری

(١٨٩٥؟-١٩٦٢)

نێوێ عەبدولخالق کوڕی شێخ حوسێنی نەقشبەندییە[*] لەساڵی ١٩٨٥(؟) لەشاری کەرکووک هاتۆتە دنیا. خوێندنی زانستی ئایینی لە حوجرە و قوتابخانانداتەواوکردووە.

لەساڵی ١٩١٣(؟) گەشتێکی بەنێو شارانی کوردستان: سلێمانی، بانە، سەقز، سنە، کرماشان و هەمەدان کردووە. لەم گەشتەدا فێری چەندین جۆری زانیاری بووە. لەساڵی ١٩١٩ لەشوێنی باوکی خۆی دانیشتووە. لەساڵی ١٩٣٥ نووسەری یەکەم لەدادگەی شەرعی کەرکووک دامەزراوە و لەساڵی ١٩٥٨دا خانەنشین کراوە. لەساڵی ١٩٦٢دا کۆچی دوای کردووە.

ئەسیری لەگەڵ ئەوەی هەستیار بووە، بابەتی زمانەوانیشی هەبووە؛ بۆیە دەستنووسی دوو فەرهەنگی لەدوای خۆی بەجێماوە(د.کوردستان موکریانی ١٩٨٦).

لە نامەیەکدا، کە لە ٩ / ٣ / ١٩٤٣ بۆ گیوی موکریانی ناردووە بەزاری کەسی سێیەمی تاک بەم جۆرە لە خۆی دەدوێت:

عەبدولخالیق ئەسیری کوڕی سەید حوسێن ئەفەندی مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندییە و برای نەجمەددین ئەفەندی نیشتمان پەروەرە.

لەکەرکوک لەدایک بووە؛ ئێستا لە خانەقای نەقشی لە کەرکووک لە گەڕەکی ئەخی حوسێن لەجێی باوک و باپیری دانیشتووە و باش کاتبی دایرەی ئەموالی قاسرینی کەرکووکە.

(*) لەڕووی ئەوەی لە دەستنووسەکەی ئەسیری دا بەسەرهاتی نەنووسراوەتەوە، وام بەباش زانی کە کورتەیەک لە ژیانی لەو سەرچاوانەدا بخەمەڕوو، کە لە بنەماڵەی ئێمە دەست دەکەوێت.

تەمەنی لەگرێی پێنجە. لە منداڵیدا بەقوتابی لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغای مستەفا ئاغا لای حاجی مەلا محمەدی وەستا فەتاح خوێندوویەتی، لە هەژدە ساڵیدا چووەتە فەقێیەتی لە هەورامان و هەڵەبجە و جوانرۆ و بانە و سەقز و سنە خوێندوویەتی. لە پاشا گەڕاوەتەوە کەرکووک لە خزمەتی مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی تەحسیلی علوومی بەلاغەت و ڕیازیات دەکات؛ ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە و دەچێتە ئەستەمبۆڵ، لە ئەستەمبۆڵ، بەیروت و لە ئەزمیر، کەچاوی بەکاروکردەوە و ڕێکوپێکی خۆراواییان دەکەوێت- بەچ جۆرێک بڵندبوون- گەل و نیشتمانەکەی خۆی دێتەوە یاد. بەیەکجاری بیری دەگۆڕێت، کە لەئەستەمبۆڵ دەگەڕێتەوە هەر چەند هەڵبەستی خۆی هەیە کۆی دەکاتەوە و دەیسووتێنێت. چونکە ئەویش وەک شاعیرانی تر شیعری خۆشەویستی و ستایش و بەربەرەکی وتووە. لەپاش سووتاندنی شیعرەکانی سەودای گەل و نیشتمان دەکەوێتە سەری و دڵی گڕ دەگرێ و دەس دەکات بەهەڵبەستی نیشتمانی نووسینەوە. ئەم وتەیە لەگفتوگۆیدا زۆر دەڵێت: پیاو ئەوە نییە وەدووی زمان بکەوێت، (مەبەست تابعی زمان بێت) بەڵکو پیاو ئەوەیە زمان تابعی خۆی بکات (مەبەستی بتوانێت دەور بگۆڕێت).

خۆشەویستم، گیوی موکریانی! دەستی پیرۆزتان بەتوندی دەگوشم؛ لەش ساغیتان هیوامە. ئەوە وێنەکەی خۆم و تەرجەمەی حاڵم بۆتان نووسی، هەواڵی سەید حوسێن حوزنی ئەفەندی دەپرسم، ئیخلاس پێشکێش دەکەم. ئینجا پایەداربن خۆشەویستم. (هەروا بڕوا مستەفا عەسکەری ١٩٨٧ و ٢٠٠٠).

لەدەستنووسێکی گیوی موکریانیدا ئەو دێڕانەی ژێروو لەبارەیدا نووسراوە:

ئەسیری برای نەجمەدین ئەفەندی نیشتمان پەرستە. سەید عەبدولخالیق



ئەفەندی ئەسیری کوڕی سەید حوسێن کوڕی سەید عەبدی کوڕی سەید قەرەنی کەرکووکییە. لە پێش بلووغیدا لەناو قوتابییاندا دەستی بەشیعر وتن کردووە.

لەبەراییەوە بەچاولێکەری شێخ ڕەزاوە لە جنێو و سەرزەنشتدا، دەستی بە نەزم کردووە. لە مابەینی بەیانی و چێشتانی دەرگای تەبعی دەکرێتەوە.

لەناکاو کەمتر شیعری بۆ دێ؛ بۆشی بێت وەکو دەیانڵێت پەسندی ناکات. لە مزگەوتاندا خوێندوویە و کتێبی عەسری زۆر تەماشا کردووە[1].

## هێندێک زانیاری لەسەر دیوانی دەستنووسی ئەسیری

ئەو دیوانەی بەردەستتان بە خامەی بەهەشتی ئەسیری نووسراوە و لەدوای دوا ماڵاوایکردنی پێشکێش بەگیوی موکریانی کراوە. هۆی چاپنەکردنی ئە دیوانە لەلایەن موکریانییەوە لەبەر ناوەڕۆکی هۆنراوە نیشتمانیەکانی بوون؛ چونکە لەو دەمانەدا هەرگیز «ڕەقابە» ڕێگەی نەدەدا بەو شێوەیەی ئێستە بکەوێتە بەر دیدی خوێنەران و هێڵێکی ڕاست و چەپی بەسەر زۆربەی هۆنراوە نیشتمانییەکانیدا دەهێنا؛ بۆیە هەر چاوەڕێی ڕۆژێکی وای دەکرد، کە بتوانێت هەموو هۆنراوەکانی بەبێ لابردنی پەیڤێک، چاپ بکات؛ تا ئەو لە ژیاندا بوو، ئەو ڕۆژە هەر نەهات. وا من ئەمڕۆ هەبوونی خۆم لە کوردستانی ئازاددا بەهەل دەزانم، تا ئەو هیوایەی بۆ بێنمە دی و بە ڕێنووسی ئەمڕۆ بەبێ هیچ دەسکارییەک لە نێوەڕۆکی دەستنووسەکەی ئەسیری کوردپەروەر، پێشکێش بە نامەخانەی کورد بکەم.

ئەسیری دیوانی بەردەستی لەنێو پەڕاوێکی ئەسمەری ٣٣×٢٠,٥سم نووسیوەتەوە. بە پێی ئەلف و بێ، هۆنراوەکانی تێدا تۆمارکردووە.

---

(١) ئەو بابەتانەی لە ماڵی ئەسیری لە نیوەڕۆی ١٩٤٣/٥/١٦دا لە خۆی پرسیوە.

بەپێنووسی «زووپیر» پێشەکییەکی یەک لاپەڕەیی لەژێر سەردێڕی «پێشەنگ» تێدا نووسراوە(*) بەکۆتایی (خاتمە)یەکیش دیماهی پێکهێنراوە. لەسەرووی هەر پارچە هۆنراوەیەکدا ژمارەی دێڕەکانی هۆنراوەکە تۆمار کراوە، هەروەکو لە پێشەنگەکەدا هاتووە، ئەم دیوانە ٥٠٠٠ (پێنج هەزار) دێڕە هۆنراوەی تێدا نووسراوە. دیوانی بەردەست ١١٨ (سەدو هەژدە) پارچە شیعرە، کە ٦١پارچەی پێشتر بڵاونەکراوەتەوە، کە ئەم ناوونیشانەی ژێرەوویان بەخۆوە گرتووە:

١- گفتوگۆی ژوور ئەکا ٢- هاوارە پێغەمبەر ٣- یا محەمەد مەدەدێ ٤- ئەم پەرێشانییە هەتا کەی بێ ٥- هەتا هەتە ٦- فێری عیلم بە ٧- نیکۆتین ٨- حیکمەتی خوایە ٩- ئەمین زەکی ١٠- ئەوروپا پشتی شکا ١١- کوسی ١٢- کۆی گەلان ١٣- مرثیە لبنت ملا صدیق ١٤- چاخی سەحەر ١٥- تەننەور ١٦- جەمال بەگ بابان ١٧- مەردی میللەتی ١٨- ئەی نەوەی کورد ١٩- بروا و کاکە ٢٠- مەعرووف جیاووک ٢١- مەلیک غازی ٢٢- شیری برندە قەڵەم ٢٣- پێوەبووم ئەمما چلۆنیش پێوەبووم ٢٤- تەئریخی کێڵێ ٢٥- سەید ئەحمەد خانەقا ٢٦- شادە گەلت ٢٧- کیژ و ژنان ٢٨- کەس نەناس ئەمڕۆ ٢٩- دەمپەرستی وەتەن ٣٠- یانە ٣١- شەدە لار ٣٢- لەدەستەی پەهلەوین ٣٣- مەرسییە(لاواندن) ٣٤- ڕۆژهەڵاتی نیشتمان ٣٥- جێگای موقەدەسە ٣٦- میللەت و وەتەن ٣٧- نەخشەو جێ و پێناس و تەئریخ ٣٨- نوور ئاوا ٣٩- جگەر برژاو ٤٠- حەل نەبوو بۆ موشکلی ٤١- مەلیک فەیسەڵ ٤٢- جلک و خواردەمەنی ٤٣- بەد خوا خۆش نەبێ پێت ٤٤- ئا ئا دەبێ ٤٥-مەیلی ژاپە ٤٦- وەرە مردن ٤٧- لێی تێبگە ئەوجا

(*) شێوازی نووسینی ئەم پێشەنگە وا دەگەیەنێت، کە «زووپیر» هەرخۆی ئەسیری بێت.



حەلوابێ ٤٨- هەی وەی ٤٩- شەهیدان ٥٠- کرمانجی و لاری ٥١- کێنە لەئاستی ٥٢- ئای دەم نادەم ٥٣- ناوی پێغەمبەر برایم ٥٤- گەزۆ هاوین ئەبارێ ٥٥- نەریمان ٥٦- ساڵح زەکی بەگ ٥٧- هۆ و ساقی ٥٨- کاسەی پڕ لەخوێن ٥٩- شێخ سەحیب ٦٠- پیر مکایل.

نێزیکەی ٢٩ پارچە هۆنراوەش، کە لەنێو بەرهەمە بڵاوکراوەکانی بەڕێزان: کەریم شارەزا & جەبار جەباری، مستەفا عەسکەری هاتوون، لەو دەستنووسەدا خشتەیەکی نەنووسراونەتەوە، کە ئەمانەن:

١- چونکە بەدبەختی ٢- تێنواری ٣- پێنج خشتەکی لەسەر شیعری حافیزی شیرازی ٤- خوا هەبوو ٥- ستایشی پێغەمبەر ٦- ستایشی پێغەمبەر ٧- ستایشی پێغەمبەر ٨- سەید تەها ٩- ستایشی محەمەد ئەمین زەکی بەگ ١٠- نامە بۆ بێکەس ١١- ستایشی مامۆستا بەشیر موشیر ١٢- ستایشی بابا عەلی بەرزنجی١٣- بۆ عەبدولڕەحمان بەگی تاپۆ ١٤- بەخێر چی ١٥- بەخێر هاتنی ڕەشید عالی گەیلانی ١٦- شیوەن بۆ باوکی ١٧- شینی ساڵح بەگی ساحێبقڕان١٨- پرسەی پیرەمێرد ١٩- شیعری عەرەبی فارسی تورکی ٢٠- الوعد ٢١- شیعری کوردی (مستەفا عەسکەری ١٩٨٧) ٢٢- نیشتمان پەروەری ٢٣- ناتەواوی ٢٤- هۆنراوە ٢٥- کۆیە ٢٦- جلخوازی و ملخواری ٢٧- چوارینە(مستەفا عەسکەری ٢٠٠٠).

ساخکردنەوەی ئەم هۆنراوانە و هێنانیان بۆ سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ کارێکی وا سانا نییە؛ چونکە سەرباری ئەوەی تیپی وشەکان بەڕوون و ئاشکرا نەنووسراون، ئەسیری خۆی لە نووسینەوەی هۆنراوەکانیدا پێڕەوی یەک جۆرە ڕێنووسی نەکردووە؛ بۆ وێنە نازناوی خۆی بەم سێ ڕینووسە: «أثیری، اەثیری، ئەثیری» نووسیوە. سەرباری ئەوەش ئەم دەستنووسە هەر لەتاریکی پارێزراوە؛ بۆیە چەند ووشەیەکی ناوەڕاستی سێ لاپەڕەی بەرایی بۆمان ساخ نەبۆتەوە، لەگەڵ ئەوانەشدا خۆی هێندێک وشەی داڕشتووە و

هیچ هێمایەکیشی بۆ نەکردووە؛ تەنێ پێشەکییەکەی لێ دەربچێت کە ٢٢ پەیڤی لەژێرەوە لێکداوەتەوە، گەر هاتبا هەمان ڕێبازی بۆ هۆنراوەکانیشی پێڕەو کردبا، ئەوا کاری نووسینەوەی بۆمان ساناترو تێگەیشتنی لەلایەن خوێنەرەوە چێتر دەبوو.

لەو بارانەدا هەر ووشەیەکی بەباشی بۆمان نەخوێندراوەتەوە و بەهەموو ڕوویەک بیرمان لێکردۆتەوە، کە لەگەڵ ناوەڕۆکی بەیتە شیعرەکەدا بگونجێت، ناچار هەروەکو خۆی نەخشاندوومانە و هێمای (؟)مان لەپاڵی داناوە.

لەڕووی ئەوەی ئەسیری بایەخێکی زۆری بەناوەڕۆکی هۆنراوەکانی داوە، لە گەلێک شوێندا هۆنراوەکەی لەنگ بووە و کێش و سەروای کردۆتە قوربانی ناوەڕۆک.

## ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی ئەسیری

لەنێو هۆنراوەکانی ئەسیری دا هۆنراوەی نیشتمانی، هۆشیارکردنەوەی هەستی نەتەوەیی، زانستی، ئایینی، پێدا هەڵدان و شیوەن بەرچاو دەکەون.

## هۆنراوەی نیشتمانی

بابەتی نیشتمانی و خستنەڕووی کێشەی نەتەوەیی لەنێو هۆنراوەکانی ئەسیریدا لەچاو جۆرەکانی دی، زێتر ڕەنگدەداتەوە. ئەم هۆنراوانە هێندێک جار لەشێوەی ئامۆژگاری خۆیان دەنوێنن. بەشانازییەوە لە مێژووی کورد دەدوێت. بۆ ئەوەی خوێنەر شارەزایی لەدیرۆکی دێرینی خۆیدا هەبێت و لەهەمان کاتدا باوەڕ بەخۆبییەکی پێ ببەخشێت، هانی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان دەدات، تا گەشتگوزاری تێدا بکرێت. داوا لەکورد دەکات کە خۆی بەجل و بەرگی کوردی وەک شاڵ و پەستەک و... بپۆشێت، گوێ لە



بەیات و لاوک و حەیران بگرێت سوود لە کانزاکان وەربگرێت. بەراوردێک لەنێوان خاک و خۆڵی بەپیتی کوردستان و وشکوبرینکی عەرەبستان دەکات، لەو بارەوە ڕووبەڕووی پرسیارێکی گرینگت دەکات، کە بۆچی کوردەکە لات و هەژارە، عەرەبەکەش دەوڵەمەند؟ بەراوردکردنی هەر لەم ئاستەدا نەوەستاوە، بەڵکو چەندین دەوڵەتی ئەوروپایی وەک: دانیمارک، سوێد، هۆڵەند، سویسرا و بەلجیکا بەوێنە دێنێتەوە، کە هەموو سەرمایەیان دارستانە و کەچی گەورەترین وڵاتی پیشەسازین و گەنجی ئەوان سەرفراز و لاوی ئێمەش داماو؟ ئەسیری هەر خۆی بەرسڤی ئەو پرسیارە دەداتەوە، بەوەی لاوی کورد ڕووی لەخوێندن بکات، چ لەنێو وڵات و چ لە ئەوروپادا؛ چونکە بەهێزترین چەکی خوێندنێتی. بەڵام لەهەمان کاتدا داوای لێ دەکات، کە بەهیچ جۆرێک دەست لەوڵاتی هەڵنەگرێت، لە هەوارگەی باو باپیرانی دوور نەکەوێتەوە. بەڵکو هەر وەک چیا تێیدا دابمەزرێت؛ چونکە تاراوگە تاڵە و نیشتمانیش پێویستی پێیەتی. ئەسیری نێوی زۆربەی هەرە زۆری بەرووبوومی کشتوکاڵی کوردستانی هێناوە. باس لە نێرگز، لالە، وەنەوشە، ڕەیحان، نەسرین، یاسەمین، سەوسەن و خوڕەی ئاوی جۆگە، ڕووبار، باخ، دارستان و کێڵگە و... دەکات. ئەسیری هەر بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی هەستی نەتەوەیی، بۆ فێرکردن و ڕۆشنبیریکردنی خوێنەر، هەر بەو باسانە نەوەستاوە؛ بەڵکو لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دواوە و لە پاڵیدا ئاماژەی بە دەیان زمانی دی دنیای کردووە.

هەرر لەبارەی شۆڕشی ١٩٢٥دا هۆنراوەیەکی دی بەنێوی ماتەمنامە هۆنیوەتەوە، تێدا سووربوونی کورد لەسەر وەگیرخستنی مافی ڕەوای خۆی دووپات دەکاتەوە.

لای ئەسیری نیشتمان بوو بەدلبەرێکی دلڤڕێن و تەغەززولی پێدەکات. سروشتی کوردستان- کە بەگوڵ و ڕەیحانە و سونبول ڕازاوەتەوە-

بەڕووخساری دلبەرێکی جوان چوواندووە. نیشتمانی خۆشەویستی لە نرخداریدا بێ وێنەیە؛ چونکە کێشەکەی زێڕ، زیو، دوڕوگەوهەرە. بۆیە خوێنی نووسەر نرخی ئیشقی ئەوە. ئەسیری وەکو هەر ئاشقێکی سەرخۆش و مەستی یار، لای ئەو دۆستانی نیشتمان مەرد و سەربەستن. بەدکارانیش ڕووزەرد و پەرێشان. لە هەمان کاتدا هەروەکو چۆن عاشقێک لەدەست دڵدارەکەی دەناڵێنێت، ئەویش بەهەمان شێوە لەدەست نیشتمانەکەی بریندارە، بەدناوە، سەرگەردانە، دەربەدەرە، ئاوارەیە، دێوانەیە، ڕسوایە، کوژراوی ئەشقی ئەوە، دڵخوازی ڕەنگو ڕوویەتی، هەتا لەدوای مردنیشی- کە بەخاکی کوردستان دەسپێرێن- خاک و خۆڵی نیشتمانی دەیکوشێت و دەست لە گەردەنی دەئاڵێنێت و ڕاستە لە پێناویدا ئەو هەموو دەردەسەرییە دەچێژێت؛ بەڵام خەڵک ڕەهمەتی بۆ هەڵوێستی کوردایەتی دەنێرێت.

ئەسیری لەپاڵ ئەو هۆنراوەشدا هەندێک جار وەکو مێژوونووسێک ڕووداوانی سەردەمی خۆی بەشیعر تۆمار کردووە؛ بۆ وێنە لەپارچە هۆنراوەی شەهیدان دا، کە لە ٢٠٢ دێرە شیعردا لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی کوردی کوردستانی باکوور بەسەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران دەدوێت، بەشێوەیەک وێنەی شەڕەکە دەکێشێت، هەر دەڵێت خۆی لە نێوانیاندا بووە، یەکەیەکە ناویان دێنێت، دەوریان لەو شۆڕشەدا، ئازایەتییان، هەڵوێستیان و چۆنیەتی لەنێوبردنیان پێشاندەدات.

## هۆنراوەی زانستی

ئەسیری ناوەڕۆکی چەند هۆنراوەیەکی تەرخانکردووە بۆ زانست و زانیاری گشتی، تاوەکو بەهۆیەوە بەشداری لە هۆشیارکردنەوەی کورد بکات بۆ ڕووکردنە خوێندن، دنیای ڕووناک و ڕزگاربوونیان لە نەزانین. ئەسیری هانی دایکوباوکان دەدات بۆ ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە، بۆ ئەوەی



بۆ خۆیان و بۆ نەتەوەیان پێبگەن. هەروا داوا لەمامۆستایان دەکات کە قوتابخانە؛ لەبەر چاو زارۆیان شیرین بکەن و نەبنە هۆی گومڕێییان. ڕووی گلەی لەکورد دەکات بەوەی خەنجەر و فیشەک لەخۆی باردەکات، دووربینانە ڕێنوێیی ئەوەیان دەکات، کە هەموو جۆرە زانستێک وەربگرن و فێری بن؛ هەتا ئامۆژگاری فەقێیان دەکات کە ڕوو لە قوتابخانە بکەن؛ چونکە سەرکەوتن هەر بۆ ئەو کەسەیە کە بەزانست و زانیاری چەکدارە و لەنێو میللەتدا ئەوەندە بەنرخ دەبێت، دەست ناکەوێت و ماڵی دەبێتە قیبلەیەکی وا کە هەموو کەس ڕووی تێ دەکات.

هۆنراوەی ستایشکردن و پێداهەڵدان

ئەسیری لە نێو هۆنراوەکانیدا زۆر بایەخی بەبابەتی ستایشکردن و پێداهەڵدان داوە. لە بواری ستایشدا چەندین هۆنراوەی بۆ پێغەمبەر (د.خ) نووسیوە. لەپاڵ ئەوەشدا هەولێداوە بە پیاوانی ئایینی وەک: مەلا محەمەدی کۆیی، شێخ حەسیبی تاڵەبانی، سەید ئەحمەدی خانەقا و... هەڵبڵێت. ئەسیری بەپیاوانی دەستڕۆیشتووی کوردیشی هەڵگوتووە لەوانەی، کە لەسەردەمی پاشایەتیدا پلەو پایەی بەرزیان پێدرابوو وەک: ئەمین زەکی، جەمال بەگ بابان، مەعرووف جیاووک، سالح زەکی بەگ و... هەروەها هۆنراوەی ستایشی بۆ مەلیک فەیسەڵ و مەلیک غازی هۆنیوەتەوە. زۆربەی ئەوشیعرانەی خانەی پێداهەڵدان و ستایشکردنی لەگەڵ هۆنراوەکانی نیشتمانی و کوردپەروەریدا یەکناگرنەوە.

## ئافرەت لە هۆنراوەکانی ئەسیری دا

لەپێشەکی ئە م دیوانەدا هاتووە، کە ئەسیری نێزیکەی چوار هەزار دێرە شیعری دڵداری هەبووە و هەموویانی سووتاندوە. دەڵێن لەدوای ئەمە دەستی لەنووسینی شیعری غەزەل هەڵگرتووە و هەر خووی داوەتە هۆنینەوەی شیعری نیشتمانی و نەتەوەپەروەری. ئەسیری ویستوویەتی ئەم

هەڵوێستەی لەلایەن بوێژانی هاوچەرخیشیدا ڕەنگ بداتەوە؛ بۆیە داوا لە وێژەوانی کورد دەکات، کە دەست لە باسکردنی چاو و خەتوخاڵ هەڵبگرێت و چیدی هۆنراوەی عیشق بازی نەهۆنێتەوە بەڵکو هانی دەدات، کە ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی بابەتی مێژوویی بگرێتە خۆی، هەروەکو هۆمیرۆیس، تاوەکو میللەتەکەی هۆشیار بکاتەوە.

لەگەڵ ئەو ئامۆژگاریەشدا ئەسیری نەیتوانیوە خۆی لە جیهانی ئەوینداری ڕزگار بکات؛ بۆیە لە تەمەنی پیریشدا چەند هۆنراوەیەکی دڵداری هۆنیوەتەوە هەروەکو لە نێو دیوانی بەردەستدا چەند هۆنراوەیەکی دڵداری بەنێونیشانی: شەدەلار، نوورئاوا، جگەربرژاو، کاسەی پڕ لەخوێن و هۆ ساقی(ئەمەی هەرە دوایی دڵداری و نیشتمانییە) بەرچاو دەکەون.

ئەسیری لەم هۆنراوە دڵدارییانەدا هەستی ناوەوەی خۆی بەرامبەر بەدووری یار دەخاتەڕوو. لە چەندین دێڕی ئەم هۆنراوانەدا ڕوومەتی دڵخوازەکەی بەهەتاو دەچوێنێت؛ کەچی ئەو لەدووری هەتاو دەسووتێت، یار بەڕێگەی بڵێسە ڕووی دەیخاتە داوەوە. لای ئەسیری جیهان بەبێ خۆشەویستی کپ و خامۆشە، هەر تەنێ بەهۆی دڵداری  دنیا زیندووە.

ئەسیری لەپاڵ ئەو هۆنراوە دڵدارییانەدا وێنەیەکی نوێی ئافرەت دەکێشێت، کە زۆر جیاوازی لەگەڵ هۆنراوەی شاعیرانی هاوچەرخی خۆیدا هەیە؛ چونکە ئەو توانایی ژیری و هزری ژن دەخاتەڕوو، نەک هەر ڕووکەشی دەرەوە. بۆ وێنە لەو هۆنراوەیدا کە لەبارەی گەشتەکەی خۆی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا کە بۆ کوردستان کردوویەتی، لە بارەی خانمی میری دێی دەشتی سەقزدا دەدوێت و دەڵێت: خانمی دێ هاتە گفت و گۆ... بیرو هۆشی سوقراتانەبوو. دواتر دەڵێت: خوێندەوار بوو شارەزایی لە زمانی فارسیدا هەبوو، کاتێک، کە ڕاپۆرتێکی لەبەر دەم هەمواندا نووسیوە، وای کردووە کە ئەسیری لە هۆنراوەکەیدا بڵێت: من لە جێی خۆم



ماتبووم، تێگەییم ئەوسا، کەمێشکی پیاو و ژن فەرقی نییە. هەر لەو پارچە هۆنراوەیەدا هاوبەشیکردنی ئافرەت لە گفتوگۆ، پێشوازیکردن لە مێوانانی نێو دیوەخان پێشان دەدات؛ هەروەها لەشاری سنەدا ژنی وای چاوپێکەوتووە، کە مۆر هەڵکەن، سەئات ساز، خۆشنووس و شاعیر بوون.

ئەسیری پارچە هۆنراوەیەکی بۆ کاروپیشەی ژنانی سەردەمی خۆی تەرخانکردووە، کە یارمەتی پیاوان دەدەن لە خانوبەر دروستکردن. زۆربەیان خەریکی بەرهەمهێنانی پێداویستی خێزانیان بەڕێگەی چنین، دوورین و بڕین دەبن، هەروا ئاماژە بەوە دەکات کە لاکێش، خورج، جاجم و... دروست دەکەن؛ لەپاڵ ئەوانەشدا مێوان بەڕێدەکەن. کەچی دەسەڵاتدارانی کورد خوێندەوارییان هەبووە، ئەسیری لەو باوەڕەدایە گەر لە نێو کوردستان پیاو نەما، ئەوا ژنانی کورد دەتوانن لەبرێتی ئەوان هەموو کاروبارێک هەڵسووڕێنن.

شاعیر لەپارچە هۆنراوەیەکی دی، ڕۆڵی ئافرەت لەکاتی ڕوودانی شەڕدا دەخاتە ڕوو، کە چۆن یارمەتی ئەو پیاوانە دەدەن کە لەسەنگەردان. ژن نان و ئاویان بۆ دەبات، برینیان سارێژ دەکات، لە برێتی ئەوان دەبن بە باخەوان، شوان. لەو بارەدا شەڕ توندتر دەبێت، ئەوە مێینەش دەچنە مەیدانی شەڕ. ئەگەر چی بوێژ لەو هۆنراوەیدا ڕوویەکی گەش و ڕووناکی بۆ توانای ژنی کوردی هێناوەتە پێش، بەڵام لە هەمان کاتدا وا هەست دەکرێت، کە ژن هەر کەسی دووەمە، شوێنکەوتەیە؛ چونکە لە کۆتایی هۆنراوەکەیدا دەڵێت:

ئەی ئەسیری میللەتێک وا بێ ژنی
تێبگە ئینجا چلۆنە پیاوییان

کوردستان موکریانی
هەولێر – بەهاری– ٢٠٠٤

## ئەسیری

ئەسیری لە ساڵانی (١٩٣٠ تا ١٩٤٠) لە کەرکووک هەمیشە بەردباران دەکراو، نیشانەی توانج و پلار و جنێو و هەزاران کارەساتانی سووک بوو، چەند جارێکیش لێیان داوە و هەڕەشەی ئەوەیان لێ کردووە، کە بەکوردی هەڵبەست دانەنێ.

کوێراییم دایێ کە لەسەر دیواری خۆیانەوە بەردبارانیان کرد، چەند بەردێکی بەسەری کەوت، تا ئەندازەیەکی زۆر مێشکی تێک چوو، پزیشکان ترسی شێت بوونیان لێ دەکرد، کاکە ڕەشید سدقی، کە کەس و دۆست و برادەری هەمیشەیی بوو و، ئامیر ئینزیبات بوو، بەشەو چەند عەسکەرێکی لە دەوروبەری ماڵی وان لە پەسیو داناو، ئەمری دا هەر کەسێکی بەو نزیکانە دا ڕەت بێ و بەردێکی بەدەستەوە بێ بیگرن و... لێ بکەن.

بەڵێ کاکە ڕەشید خەمخۆرێکی ڕاستەقینەی بوو هاتوچووی پزیشکانی پێ دەکرد، وایان بەبەرژەوەند زانی بەچشتێکەوەی خەریک بکەن تا زۆر بیر لە خۆی و بێچارەیی خۆی نەکاتەوە، نەوەکو شێت بێ، لەسەر ئەو ئامۆژگارییەی کاکە ڕەشید گەلێک ڕۆژان دەیبردە ڕاو و فێری ڕاوکردنی دەکرد، تا وەکو تەواو سەر و مێشکی هاتەوە سەرەخۆ، ئیتر لەم دواییەدا مەعرووف جیاووک کردییە سەرنووسەری دادگای (شەرعییە) و لەپاش چەندێکی خانەنشین کرا.

داخەکەم ئەسیری لە ساڵی ١٩٦٢ لە کەرکووک کۆچی دوایی کرد و، لەقسنی شێخ محێددین-دا نێژراوە.

قالەی خوشکەزای
لە شەرعییەدا نووسەرە



## وریایی

(پێشەنگ) - مقدمە

گۆڤاری (وریایی) دیوانی گەلی و نیشتمانیی خۆش گۆ و بێژەنی کوردان، سەیید حوسێن زادە مەلا عەبدولخالیق ئەسیری (ئەثیری) ئەفەندییە، هەڵبەستە و (٥٠٠٠) پێنج هەزار بێژە، کە دەکاتە (١٠) هەزار لەت، بەشێ لە هەڵبەستەکانی لەسەر تەرزی ڕۆژهەڵاتین، بەشێکیشی لەسەر تەرزی خۆرئاواین، بەگوفتی خۆی هەتا وەکو تەئریخی[١] بیست و هەشت وەکو بێژەنانی تر، بێژی خۆشەویستی و سوپاسی و بەدگۆیی وتووە، لە بیست و هەشتا کە دەچێتە ئەستەنبۆڵ لە جەبەل لوبنان و بەیرووت و ئەستەنبۆڵ هەندێ خانوو و کارخانان و، کردەی ڕۆژئاواییان دەدینێ چۆنیی خۆمان و ئەوان لێک دەداتەوە، دەردی گەل و نیشتمانی لە جەرگی کار ئەکا، ئارەزووی لە بێژەنی نامێنێ، لەمە زیاتر دەبێتە دوژمنی خوونیی خۆشەویستانی کاکۆل و زۆڵف و ڕوخسار، کە لە ئەستنبۆڵ دێتەوە نزیکی چوار هەزار بێژی دەبێ، گشتی دەسووتێنێ، چەن لاوێکی مێشک ڕوون هاتوچۆی ئەکەن و لێی ئەخوازن نووسراوێ بۆ ڕۆژنامەی پێشکەوتن بنووسێ، خواه و ناخواه هەڵبەستی (پێخوازی چاخێ)و، هەڵبەستی تەئریخی دەنووسێت و دەینێرێ، کە لە چاپ ئەدرێن، مێشک ڕوونان هەموو پێیان خۆش ئەبێ و، نامەی پیرۆزیی بۆ دەنێرن، ئەوجا بیر ئەکاتەوە و، دەس بەبێژەنی بکا چاکە، تێ ئەگا و گۆبەستی بێژی لە هەموو چشتێ کاریترە، دڵنیا ئەکا دیوانێ لە پێنج هەزار بێژ تەواو بکا، دوای ئەوە

(١) لێرە و لە هەموو شوێنێکی دیکەی شیعرەکانیشدا بە(تاریک) نووسراوە و ئێمە کردمان بە(تەئریخ).

ڕووچووی بۆ ئەوەی زوانی هەموو کوردان یەک بگرێ پێک بێنێ، هەر چەن لەبەر دەردی گەل و نیشتمان نەخۆشییێکی دایمی هەیە، پەکی بێژەنیی نەخست و دیوانەکەی تەواو کرد، هیوامان وایە بەم زووانەش ڕووچووەکەی تەواو بکا، ئینجا بۆ تەواوکردنی بناغەی کوردایەتی تەئریخێکی چاکی پێدەوێ ئەویش گردەری گۆڤاری (زاری کرمانجی) جەنابی سەید حوسێن حوزنی ئەفەندی لە پێک هێنانییەتی، کۆشین لە ئێمە و یاریدە لە خوا.

(زووپیر)



## مانای هەندێ لە وشەکان

گۆڤار: مجله
گەل: میللەت
نیشتمان: وطن
خۆش گۆ: ادیب
بێژەن: شاعر
هەڵبەست: غزل
بێژ: شعر
لەت: مصرع
بەش: حصة (قسم)
تەرز: اصول
ڕۆژهەڵاتی: شرقي
خۆرئاوایی: غربي
گوفت: کلام
تاریک: تأریخ
خۆشەویستی: محبت
سوپاسی: مدح
بەدگۆیی: ذم
مێشک ڕوون: منور
پیرۆز: مبارک
گۆبەست: معنا
دڵنیا: عزم و جزم
ڕووچوو: قاموس

بسم الله الرحمن الرحيم

## ڕەنجی بێ بەر

زانیاریی ئاشکار و چشتی پەنهانی خودا
کەی دەبێ میوەی ڕەزی کوردانی بێ کەس دەس بدا
کەس نییە غەمخواری دەردی بێ لە دەردی بێ دەوا
ناژنەوێ دەنگی کەسێ سەد جا بکا بانگو سەدا
زوو نەجاتیدە بەحەقی قودرەتت خاوەن کەرەم
سەربەخۆ بێ کوردی میدیایی[١] لە هاتف بێ نیدا
ئەم گەلە باوەڕکەرە گشتی لە بۆ بوون و یەکیت
بۆ بڵندیی دین ئەکەن ماڵ و کەس و گیانیان فیدا
زانەری ئەمڕۆ لە هەموو میللەتێ دیندار ترن
ڕاستە باوەڕیان بەتۆ، گشتیان ئەکەن ئەمرت ئەدا
زۆر ئەترسم پێک نەیێ ئەم ئارەزووەم زوو بەزوو
ڕەنج بێ بەر بمرم و گیانم لەلاشەم بێ جودا
ئەی (ئەسیری)ی پیری کوردی وەعز و ئیرشادت بکە
پێ نەزانێ میللەتت، ئاگای هەیە هەڵبەت خوا

***

(١) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (بابانی)، دواتر کراوە بە(میدیایی).



## ستایشی پێغەمبەر "د. خ"(*)

گەر بزانی تەرجەمەی حاڵی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کوێ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا
سەر ئەوەش کردەی وەهابوو خارق ئەلعادە وەها
(أشهد بالله) دەڵێ پێغەمبەرە بێ شک محەممەد مستەفا

**

نیشتمانی مەککە بوو مەککەش لە عالەم مونزەوی
دەستی تەعمیری نەدابوو دەوڵەتی عالەم بەوی
دوور لە عیلم و سەنعەت و شارانی گەورانی زەوی
مەدرەسە و مەکتەب نەبوو یەک یەک هەبوو نووسەر لەوی
تەبعی خەڵکی مل هووڕو توندو نەزان سەرڕەوی
گەر بزانی تەرجەمەی حاڵی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کوێ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

خۆی لەدایک بوو لە مەککە لای مەدینە بابی مرد
بوو بەدوو ساڵە کەچی باپیری، بابی بابی مرد
(قدرە اللە) هەرکە شەش ساڵەی تەواوکرد داکی مرد
دەستیشی زۆر زۆر تەنک بوو هەرکە خۆی ناسی چە کرد
باب و داکی زۆر فەقیربوون ماڵ و میراتی نەبرد

(*) لە دەسنووسێکی (ئەسیری) خۆیەوە وەرگیراوە. (م.ع).
(-) لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە، ب/١- ل/ ٩٠- ٩٣

گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

شیرەخۆرە چوو بەدایەن دایەنی لادێیی بوو
ڕووتەڵ و بیّ خانمان و بیّ نوێن و سایە بوو
سێبەری هەوریّ لە بۆ ئەحمەد، لەوانیش سایە بوو
هەرکە پێی گرت گەشتی بۆ سەحراو سەیری ساوە بوو
پەروەرش وابوو لە عەقلّا کەس بەوی هاوتا نەبوو
گەر بزانی تەرجەمەی حالّ موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

قافلّەی خاتوو خەدیجەی بردە شام و هاتەوە
دچووە ئەشکەوتی حەڕا ڕۆژیّ شەپرزە هاتەوە
پرسی لێی خاتوو خەدیجە تێک چووی بۆ؟ چیتە وا؟
سنگیان شەقکردم و شتیان و لێکیان نایەوە
سوورەیی (اقرأ) مەلایک پێمی وت خۆنرایەوە
ست خەدیجە و خالّی وتیان: تۆ (رسول الله)ی ئەوە
گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

بوو بەپێغەمبەر لە چل سالّە لە مەککە زانرا
دەعوەتی دینی موبینی کرد و بانگی لیّ درا
تاکو دە سالّ دەعوەتی خێلّی قورەیشی لیّ کرا
کەلّکی چەندانی نەبوو ئەو سەروەرە ئەزیەت کرا



بۆ مەدینە هیجرەتی فەرموو لەویّ گیرسا چرا
گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

گشت جەزیرەی گرت بەسێزدە سالّ بەحرێنیش لەگەڵ
خەڵکەکەی هەیکەل پەرست بوون گاور و جوو زۆر چەپەڵ
گشتی کردە (مؤمن بالله)، نەما لات و هوبەل
میللەتی وای پیّ گەیان تەسلیمیان بوو چەند دووەل
قەیسەرو کیسرا نەما عینوانیان بوو بەمەسەل
گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

بۆ عەمەل قورئانی هێنا گفتی یەزدانە ئەوە
تاکو نەفخی سوور ئەبیّ، دەستووری ئینسانە ئەوە
حەربی ئێستایش مەوزیعی تەرتیب و پیلانی ئەوە
عەهد و پەیمانی قورەیش عەقلّی حەیرانی ئەوە
گەر مەدەنییەت هەبیّ ئاساری ئینسانی ئەوە
گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کویّ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

**

خوێندەواری هیچ نەبوو تەوراتی خوێندبێتەوە
یانەخۆ ئینجیلی عیسای دیبیّ لێی وردبێتەوە
زەند و ئاویستای مەجووس دەرسی نەدی بوو خۆ لەوە
هەر دەستووری ئەهریمەن خۆ نەبوو باسی ئەوە

(أشهد باللە) رەسولی خوایە خوا کردی ئەوە
گەر بزانی تەرجەمەی حالّی موحەممەد مستەفا
مەنشەئی کوێ بوو چلۆن پەروەردە بوو دیتی جەفا

***



## ئەربەبا

دەردی دلّم وەک ئەربەبا ، زیرەم کە دێتە گوێت بەبا(*)
بۆ زیز ئەبی ئیمانەکەم، چبکەم بەمە ئەیدەم بەبا
خۆت با ئەدەی، خۆت لا ئەدەی، ڕوویی شیرینت دائەدەی
بەندی جگەر بۆ با ئەدەی، نابی لەگەڵما بۆ تەبا
ئەی نیشتمانی باغی گەشت(۱)، سینەت گوڵستانی بەهەشت
دەنگی بول و بۆیی گوڵت(۲) دڵ مەست ئەکا ساقیی(۳) سەبا
هاواری من فەریادی من، ڕۆژی ڕەشی بەربادی من
مەستی و قەشەنگی و شۆخیی(٤) تۆ، هۆشی سەری سوقرات ئەبا
جەرگ و دلّم وا بوو بەخوێن، وەک گێژ ئەڕۆم بێ ڕێ و شوێن
چارەی نییە دەردت دەڵێن دیزانتەری و سیلە و وەبا
سینەی سووتاوم شەق بکەی، پۆرگی دلّم گەر(٥) لەت بکەی
سەیری کەژی هەمم بکەی، گردێکە وەک قافی قوبا
ئەی دۆتە گوفتت دا بەکێ، بوویتە وەوی و میوانی کێ
دەردی دلّم بێژم بەکێ، خۆم ڕەنجەڕۆ و کردەم هەبا

---

(*) ئەم شیعرە لە دیوانی چاپی (مستەفا عەسکەری)شدا هەیە (کە لەمەودوا بە«م. ع»ی ناودەبەین) – ب/۱ – ل/٦۲ – ٦۳
(۱) لە چاپی (م. ع)دا: (باغی کشت)ە.
(۲) لە چاپی (م. ع)دا: (گولّی)یە.
(۳) لە چاپی (م. ع)دا: (ساقی)یە.
(٤) لە چاپی (م. ع)دا: (شۆخی تۆ)یە.
(٥) لە چاپی (م. ع)دا: (لەت لەت بکەی).

لەومم دەکەن گەورە و بچووک، سووتام لە شاری کاری کووک
وا بوومە پەن ڕیسواو و سووک، نالێن (ئەسیری) مەرحەبا

***



## جەژنە پیرۆزەی نەورۆز

پیرۆز بێ جەژنی تۆ ئەی کوردی گوردی باوەفا[*]
سەد جەژنی وا بدینی بەدڵخۆشی وو سەفا
دەستی مویارەکت بدە لەم ڕۆژە بیگوشم
ئەم ڕۆژە ڕۆژی هۆگرییە و ئاشتی وو تەبا
ئەم ڕۆژە ڕۆژی شادی وو جەژنی برایە
پەیغامبەرێکی کورد بوو لە ئاسوور و نەینەوا[1]
ئەم ڕۆژە ڕۆژی کۆمەڵ و بەزم و زەماوەنە
ئەم ڕۆژە دەسگوشین و وتەی خۆشی مەرحەبا[2]
لاوان بەڕۆژهەلاتی کوردی لە گەشت و کەیف
پیران لە نوێژ و تاعەت و ئەمری خوا
پەیمانێ بێت و ئەلەم[3] ڕۆژە گەر گرێ درێ
لاوی گرێدەری بەئەواتی[4] دڵی ئەگا
جەژنی هیوایی گەل بێ (ئەسیری) بەدڵ دەڵێ
پیرۆز بێ جەژنی تۆ ئەی کوردی گوردی باوەفا

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/٢ - ل/٢٦
(١) ئەم دێڕە شیعرە و دێڕی دوای ئەمە لە چاپی (م. ع)دا پاش و پێش کراوە.
(٢) لە چاپی (م. ع)دا: ... وتەی خۆش و مەرحەبا.
(٣) لە چاپی (م. ع)دا: ئا لەم.
(٤) لە چاپی (م. ع)دا: بەئاواتی.

## مرشیه بنت ملا صدیق رئیس محکمه کرکوک(*)

گوڵی نازە لە گوڵزاری بەهارا
لەناکاو هەڵوەری لەم نەوبەهارە
دەسی قودرەت، گوڵی هەڵکەن لە چەمەن
ئەلەم گوڵزارە دەستی هەر لە کارە
گوڵی شیرین و شۆخی سەعدییە ناو
نەبوو بۆ دەردی بێ دەرمانی چارە
لە داخی دەستە خوشکانی پەرێشان
لە زانستی گرین و شین و زارە
چەمی باڵای ڕەئیسی بابی بۆ ئەو
تەپی پشتی کەس و خزمی لەقارە
لەکانا خۆزگە گێتی هەر نەبایە
کە بۆ مردن نەبایە لەم دیارە
لە تەئریخی چووە بۆ (باغی فیردەوس)(*)
بەئەو پیرۆزە ئەم کۆچ و هەوارە

***

(*) لەتەک ناونیشانی شیعرەکەدا مێژووی (١٣٥٥ی. هـ) نووسراوە. کە دەکاتە (١٩٣٦ - ١٩٣٧)ی. ز. بەڵام بەپێی ژماردنی ئەبجەدیی (باغ فردوس)ی تەئریخی دوا دێڕی شیعرەکە (١٣٥٣)ی. هـ. دەگرێتەوە کە دەکاتە (١٩٣٤ - ١٩٣٥)ی. ز. (ت)



(......)

پێنج دەستە گەل هۆشیار ئەکا
پاتەخت و موڵک و شار ئەکا
(ئەرژەنگ) لە کەوری تار ئەکا
گەردەن بەدوژمن لار ئەکا

زانین و کردەی کارگەری
خۆشخوانی ئینجا بادەری
دانانی هێزی لەشکەری
ئەو هێزە بۆ گەل کار ئەکا

بێت و کەسێ نەگرێ ئەلەم
پێنج ڕێیە چشتێ زۆر و کەم
وەک توورگی ناوەندی چەم
بارێکە گەل بێزار ئەکا

دەرمانگەرێکی میللەتە
ناوبانگی (تاهیر بەهجەت)ە
(سائیب) زەوی پێوی کەتە
دەیم و بڵند ئاودار ئەکا

لاوانی وا بینایی گەل
کەڵکیان ئەبینم چاخی هەل
(هەڵبەست) ئەنووسم بۆ ئەوەی
دەردێکی کوردان چار ئەکا

هەرچی کەسانی (لەشکەری)
(مامۆستا) وو (کارگەر)ی
زانا وو پیاوی باوەڕی
ئەو (مەردە) گەل بێدار ئەکا

نیشانەیان و کردەیان
یەک یەک لە دووی یەک چاپ ئەکەم
بێژەن (ئەسیری) کەوتە خۆی
بۆ گەل ئەوا گۆڤار ئەکا...

ئاداری ١٩٣١



## گفتوگۆیی ژوور ئەکا

حیکمەتێکە عەشقی مەردوم ڕۆحی عاشق ژوور ئەکا
دل لەمەیلی ژین و خۆشی، کەیفی دنیا دوور ئەکا
بێجگە بیری خۆشەویستی و مەیلی لێ خۆشبوونی ئەو
هیچی دیی هیوا نییە، بەو یادە خۆی مەخموور ئەکا
سۆزی جیایی سەر کز و پەژموردە و وێڵی ئەکا؟
ئاگری سینەی گرفتاری وەکو تەندوور ئەکا
قووەیێکی مانیتیزمینی لەلایە خۆشەویست
مەژگی عاشق دەم بەدەم بەو قووەیە پڕ نوور ئەکا
هیچ نەترسا، کەوتە ناو ئاگر برایم عاشقی؟
ئاگری سووری وەکو بەفری سپی بەللوور ئەکا
هەر وتی مەنسوور (أنا الحق)، تا بەئەزیەت کوشتیان
ڕەنجی عاشق زۆر عەجەب خۆشویستنی[1] ئەستوور ئەکا؟
عەشق دوو عەشقە، یەکێ عەشقی خوا، یەک میللەتە
بێجگە لەم دوو خۆشەویستە عاشقی ڕەنجوور ئەکا
ڕوو لە مەیلی عیشقی زوڵف و کاکۆڵی شیرین مەکە؟
عیشقی نیشتمان و گەلە مەژگی تەڕت پڕ نوور ئەکا
عیشقی میللەت ئیختیاری دەس ئەسیری-ی سەندووە
بۆیە بێ پەروا ئەوەندە گفتوگۆیی ژوور ئەکا

***

(١) لە دەستنووسدا (خۆشەویستی)، لەبەر نارێکیی کێش کردمانە خۆشویستنی.

## شیوەنی شێخ موحەممەدی کەرەدان

له ڕێگەی نەعشی پاکی شێخ موحەممەد سەییدی واڵا[*]
هەزارانێ لە دەوری دارەمەیتی مەرقەدی ئاڵا
وەها هاژا بوو عالەم هەر وەکو دەریا لەمەوجابێ
لە یەکتر بێ خەبەر مەستانە، دەبزووتن هەموو لالا
لەسەر دەس، دەس بەدەس، تاکو گەیشتە گۆڕی پڕ نووری
بەڕووی یەک، مەردم و حۆری و فریشتە[1]، گشتی هەڵ کاڵا
بەشەر دەیویست زەوی بێ جێی، مەلەک دەیبردە عیللییین[2]
سوڵح وا بوو لەشی لێرە، مەلەک[3] ڕۆحی بەرێ باڵا
ئەساسەن ڕۆح پەروەر بوو، لە دنیا و لەززەتی بێزار
لەشی بەرگێکی کولفەت بوو، بەمردن ڕۆی[4] و داماڵا
سەما وا غارەتی کرد، کۆمەڵی نووری بەیەغما[5] برد
ئەمە پیشەی سەمایە، ڕووی زەوی هەردەم ئەکا تاڵا
بە(غوفرانی وەدوود)[6] تەئریخی ساڵی ڕیحلەتی شێخ بوو
بولی باغی بەهەشتە شێخ موحەممەد سەییدی واڵا

***

(*) ئەم شیعرە لە دیوانی (م. ع)یشدا هەیە. ب/١ - ل/ ١٣٠ - ١٣١
(١) لە چاپی (م. ع)دا: فرشتە. (٢) لە چاپی (م. ع)دا: عەلی یین.
(٣) لە چاپی (م. ع)دا: فەلەک. (٤) لە چاپی (م. ع)دا: ڕۆیی.
(٥) لە چاپی (م. ع)دا: بەلوقیا برد.
(٦) دەبێ بەپێی ڕێنووسی کۆن بنووسرێتەوە (غفران ودود) کە بەپێی ژمارەی ئەبجەدی دەکاتە (١٣٦١)ی هیجری (کۆچی)ی بەرامبەر (١٩٤٢ - ١٩٤٣)ی زایین... (ت).



## شینی شەهیدانی کورد[*]

یارەب چە موسیبەتێکە لە کوردانی ئێمە قەوما
لەم میللەتە مەزڵوومە نە خۆراک و نە خەوما
خوێنی شوهەدا هەر وەکو سێلابی بەهارە
هەروا لەشی کوژراوە دەتلێ بە ڕووبارە
هاوار و گرین و جەزەع و ماتەم و شینە
ئەم زوڵمە لەبەر ئارەزووی دینی موبینە؟
شێخ و عولەما و سەید و سادات و ڕەئیسان
بێ شوبهە بەناحەق هەموو بێکردەوە کوژران[1]
بۆتی بژمێرم شوهەدای وەتەن و دین
بڕوانە دوو چاوت بەخوڕەم جۆگەی خوێنین
شێخ قادری سەردار و موحەممەد خەڵەفی ئەو
دکتۆر فوئادە کەسی من گوێ گرە بشنەو[2]
سەعدی بەگ و فەوزی بەگ و قاسم بەگ و خان بەگ
یوزباشیە فیکرەت بەگ و، ئەجزاچی سالح بەگ
شێخن هەموو عەبدوڵلا و سەیفوڵلاە دیندار
مەلا سەلیم نەقشی، لە باتنی دڵی هوشیار

(*) لە میناى شکستە لاپەڕە (٤٠٧) و (٤٠٨) وەرگیراوە. لە کاتی خۆیدا لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە) ژمارە (٤٧)ی ڕۆژی ١٩٢٥/١٢/٥دا بڵاوکراوەتەوە.
لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/ ٢- ل/ ٦٦- ٦٧.
(١) بێ کردەوە: بەبێ ئەوەی هیچ کردەوەی خراپیان هەبێ.
(٢) بشنەو: ببیسە.

ئایا چە ڕەئیسێ بوو، لە عەشیرەت حەمە ئاغا؟
بۆ شێخ عەلی دڵ دەسووتێ سینە لە داغا
یوزباشی قادر بەگ و ئەبوبەکر و عیززەت سەردار
ئیعدامی مەلا قادری کرد دوژمنی غەددار
خۆی کردە فیدای وەتەن کورد سەعید بەگ
قوربانی وەتەن بوو بە سەرو ماڵی ڕەشید بەگ
کوژراوە ئیسماعیل بەگ ئەمما بە چ غەدرێ
بۆ لاوەکانی بەدرخانی سینە دەکوترێ
خۆی و کوڕەکانی یە شەهادەت هەموو ڕۆیین
موفتی لە دیاربەکر ئەمانە هەموو خۆیین
ساڵح بەگی پاشا چە ڕەئیسێ بوو دەزانی؟
مەعسوومی برایم پاشا فەوتا چووە فانی
گەورەی هەموو لایێ بوو ڕەئیسی هەموو میللەت[٣]
خۆی و کوڕەکەی شێخ سەعید کەوتنە زیللەت
دیندار و موسڵمان و موتیع بوون بەشەریعەت
زۆریان عولەماو سەیید و ئەربابی تەریقەت
گەورە بەهەزاران و ڕەعیەت بەملیۆن
چەند سەدی دی، چوونە ئەگەر، بێ سەروشوێن[٤]
ئەم دەرد و بەڵا و ئەلەمەی هاتە سەر ئێوە
ئەی کوردە مەگەر چێشتبێتی خانلغی خێوە
خوێنی دڵە دەڕوا لە دوو چاوی کەسی کوردی
پیاوی وەتەنی وایە، برا گەورە و وردی

---

(٣) لە ژیانەوەدا لەجیاتی (کە گەورەی هەموو) نووسراوە (کە نووری هەموو).

(٤) بەشێوەی ئەسیری و بەپێی سەروا (قافیە) دەبێ (سەروشۆن) بێ (ت).



ب

## هاوارە پێغەمبەر

هاوارە پێغەمبەر بکە دەرمانی دەردی یا تەبیب
کەوتۆتە دەردی بێ دەوا چارەی بەتۆ دەکرێ حەبیب
ئەم بێکەسە بێ چارەیە ئەم لوڕ بەچە ئاوارەیە
بێخاوەنە بێچارەیە چەن قەڕنە وا دەدرێ فریب
سۆڵتانی بوو سامانی بوو، سوڵتانی وەک ساسانی بوو
ڕۆستەم کوڕی مەیدانی بوو، تۆرانی مل کەچ بوو عەجیب
ئەو خزمەتەی کردی ئەبو موسلیم بۆ نەسلی هاشمی
ئەهلی سەڵیبی وەرگەڕان، یووسف سەلاحەدین نەجیب
هاوارە پێغەمبەر بکە لای خوا شەفاعەت بۆ ئێمە
کوردان هەموویان میللەتت ماون لە حیرەتدا غەریب
نەوزادی ڕۆڵەی کوردی گورد بەختت بەبیرم تازە مرد
ماوی بەخۆت ڕووت و زوگورد، کۆشش کە ئینجا یانەسیب
دوعا بکە بۆ میللەتت داکو نەمێنێ ئەزیەتت
هەر چەن کە زۆر بوو، مینەتت بانگ کە (ئەسیری) یا موجیب

***

م

## هەوای نەسیمی

بەخاکی ولاتم، گەلم[١]، میللەتم[*]
کەسم کۆمەڵم لائەبەن[٢] زیللەتم
هەوایی نەسیمی بەسەر گوڵشەنا
لە سەیری ڕەزان مەحوئەکا عیللەتم
بەباغ و بەبێستان و میوەیی جوان
بەئاوی ڕەوانان ئەبێ لەززەتم
لە دامێنی بێستان تەماشای چیا[٣]
لە بیرم چلۆن دەر ئەکا ئەزیەتم[٤]
ولاتم گوڵ و ئاو و باغ و ڕەزە
وەکو کەوسەرە کانیی جەننەتم
بلند و بەئیرادە شاخ و چیام
وەکو ئەو بلندە منیش هیممەتم
(ئەسیری) لە ڕێی خاکی پاکی وەها
بکوژرێم فیدابم نییە میننەتم

***

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/ ٢ - ل/ ٤٩

(١) چاپی (م. ع): گلم.

(٢) چاپی (م. ع): لائەبا.

(٣) چاپی (م. ع): لە دامێنی بێستانما شای چیا،

(٤) ئەم نیوە دێڕە شیعرە و نیوەکەی دوای ئەم، لە چاپەکەی (م. ع)یەوە کەوتووە.



## بۆ مودیری کائینات[*]

دایم لەفیکر و زیکری خەیاڵاتی میللەتم
بۆیە وا کز و مەلوول و بەسۆز و حەسرەتم
ئەی ڕۆڵە دەردی تۆ بەندی جگەرمی بڕی
تەئسیری داغی حاڵی تووە من بەعیللەتم
ئەم کوورەیەی لە سینە دەگرێ وەها بەجۆش
تیایا بەڕاستی دەسووتێ جەرگی لەت لەتم
شەرت بێ نەکەم لە کاری تۆ یەک زەڕەیێ قسوور
گەرچە لە مەعرەز تووشی سێدارە و پەتم
من پیر و مورشیدی تۆم نەوڕەسیدی گوڵ
گەر بمکوژن لە ئیشی تۆدا، نابێ میننەتم
ئەم ئارەزووی ئاتەشینە لەمن ئاشکارە بوو
لۆمەم دەکەن لە تەوبیخ و بەحس و سوحبەتم
هەرچەند کە تووشی تەهلوکەیێ بم لە ڕێی وەتەن
دەم دەم زیاد ئەبێ شەرەف و شان و عیززەتم
چارەی تۆ ئینتیباهێک و عیلم و مەعاریفە
چارەی منیش فیداتی بکەم نەقدو سەروەتم
عەرزی «ئەسیری» لە خزمەتی مودیری کائینات
یارەبی تەڕەحومێ بەگەلی کوردی میللەتم

(*) لە ژمارە (٧)ی ساڵی یەکەمی زاری کرمانجی لاپەڕە (١٩)ەوە وەرگیراوە. (م.ع).

- ئەم شیعرە لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە- ب/ ١- ل/ ٤٠

## جەرگی لەت لەتم

دایم لە بیری وردی تێبینینی میللەتم
بۆیە کز و مەلوول و بەسۆز و بەحەسرەتم
هۆ[1] ڕۆڵە دەردی تووە بەندی جگەرمی بڕی
تەئسیری داخی حاڵی تووە من بەعیللەتم
ئەم کوورەیەی لە سینە دەگرێ وەها بەجۆش
تیا بەڕاستی دەسووتێ جەرگی لەت لەتم
شەرت بێ نەکەم لە کاری تۆ یەک زەڕەی قسوور
گەرچی موحەققەقە تووشی سێدارە وو پەتم
من پیر و ڕەهبەری تۆم نەوڕەسیدی کورد
گەر بمکوژن لە کاری تۆدا نابێ میننەتم
ئەم ئارەزووی ئاتەشینە لەمن ئاشکارە بووە
لەومەم دەکەن گەهێ، هەڕەشە و باسی جەننەتم
هەرچەن کە تووشی تەهلوکەیێ بێم لەسەر وتن
دەم دەم زیاد ئەبێ شەرەف و شان و عیززەتم
چارەی تۆ زیندەیی وو عیلم و سەنعەتە
چارەی منیش فیداتی بکەم پوول و سەروەتم
عەرزی (ئەسیری) لە خزمەت مودیری کائینات
یەزدان بەزەییت بێ بەکوردی هەژاری میللەتم[2]

(١) سەرەتا (ئەی) نووسراوە دواتر کراوە بە(هۆ).
(٢) سەرەتا ئەم نیوە دێڕە لە دەستنووسەکەدا نووسراوە: (یا ڕەببی ڕەحمێ بەگەلی کوردی میللەتم) دواتر بەو شێوەیە گۆڕاوە کە لەسەرەوە دانراوە.



## کووسی

مەژنەوە باسی (کەیومەرث) و کەیان و یەزدیجوردم
بژنەوە تەئریخی باپیرت سولالەی کوردی گورد
تۆ گەلێ بووی نیشتەیی دەشتی عێراقی لای جەنووب
دوور لەشەڕ، بێ فیتنە وو ئازادە وو سەربەست و گرد
خێڵی کلدانی کە هاتن وەحشییانە و پڕ نیفاق
هەندێکی بۆ پێشی کووهـ و پشتی کووهـ چوو خزمی کورد
هیچ نەبوو بوون سەرفرۆیی ئێرانییان، مان سەربەخۆ
پاڵەوانیان پێ وتن بەزوانی خۆیان یەعنی گورد
بۆ ئەرارات هێندێکی چوو لورد هەو تەسلیمی بوو
لورد بە گیان وت بەمان بەزوانی خۆیان یەعنی کورد
تێکەڵی هتتیت و فارس لورد بووە فەرقی زوان
یا نەخۆ یەکبوو زوانی کووسیی باپیری کورد
چەن عەتیقەی پێشی کلدانی لەجێی تۆ کەوتە دەر
ئەی ئەسیری دیارە زۆر سەرکەوتووە زوو خێڵی کورد

***

## ئالام(*)(١)

چاخێ ئەمنیش(٢) حاکمی مەجمووعی جیهان بووم
مەڕوانە ئەلەم ڕۆژە کە بێ ناوونیشان بووم
نووسراوە لە تەئریخی بەشەر کوردەوەیی من
باعیس بەنەزانینە لەتۆ من کە نیهان بووم
ئەو ڕۆژە حەمموورابی سەرە و ژێر بوو لە دەستم
ناوی من ئە لەو ڕۆژە کووسی فەردی جیهان بووم(٣)
ئالام و کووسی(٤) هەردوو برا بوون و لە ئاری
ئالام بووە فارس ئەمنیش گوردی ئەوان بووم
من بوومە ئەسەل کووتەهیی دەوڵەتی ئاسوور(٥)
من مونجیی دانیالی بەنی ئیسرائیلیان بووم(٦)
بابل بەقووەی لەشکری من بوو بەخەرابە
ئەستێرە پەرست بوو(٧) ئەمنیش ئەهلی ئیمان بووم

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/٢ – ل/٤٤
(١) مەبەست لە (ئیلام – عیلام)ە، شاعیر خۆی بەو شێوەیەی نووسیوە.
(٢) چاپی (م. ع): وەختێ بوو منیش...
(٣) چاپی (م. ع): ناوی منە ئەو ڕۆژە قیسی فەردی جیهان بووم
(٤) چاپی (م. ع): قەیس
(٥) چاپی (م. ع): من بوومە سەبەب خاتیمەی دەوڵەتی ئاسوور.
– لە دەستنووسدا بە(آثور) نووسراوە.
(٦) چاپی (م. ع): من مونجی دانیال نەبی ئیسرائیلیان بووم
(٧) چاپی (م. ع): بوون و...



والیم لە بەرەغمە هەبوو جێی ئێستەیی ئزمیر(٨)
لەو چاخە(٩) حوکمڕانی هەموو ڕۆم و یۆنان بووم
چەن جار یەمەنم گرت و ئەهالی بووە مل کەچ
گورزم هەبوو خاوەن(١٠) سوپەه و تیر و کەوان بووم
تێکۆشە لە بۆ سەتوەتی جارانت (ئەسیری)
لەم ڕێیە بکوژرێی(١١) مەڵێ من تووشی زیان بووم

***

(٨) ئزمیر: شارێکی کۆنی تورکیای ئێستایە، لەسەر ڕۆخی دەریای ئیجەدا.
(٩) چاپی (م. ع): ئەو وەختە
(١٠) چاپی (م. ع): ساحێب.
(١١) چاپی (م. ع): لەم ڕێگە.

## پێوە بووم ئەمما چلۆنیش پێوە بووم

پێوە بووم ئەمما چلۆنیش پێوە بووم
وا لەشم فەوتان و ئینجا لێوە بووم
چوومە ئەستەنبووڵ لەساڵی بیست و هەشت
پیری پیران دەرسی دام و تێوە بووم
عیشقی نیشتمان و گەلم وا کەوتە سەر
شێت و شەیدایی گەیینە هێوە بووم
باو و باپیر هیچ نەجووڵان بۆ وەتەن
بۆیە من ئەمڕۆ لە جێو و ڕێوە بووم
گەر بپرسی بۆ چی وسکت بوون دەڵێن
چاخێ من ئەم باسمە کرد من گەورە بووم
گەر نەجووڵێم ساوەلەعنم لێ دەکەن
شکڵمش پێش چاویان وەک دێوە بووم
تووشی دەردە پیاوی دەوری ئینقیلاب
بۆیە وەک سووتاوەکانی خێوە بووم
هەر دەبێ بۆ گەل بکۆشی ڕۆژ و شەو
ئەی (ئەسیری) سەد بڵێی من پێوە بووم

***



## تەئریخی کێلی گۆڕی خێزانی عەلی کوردی

لە گوڵزاری جوانان نەورەسێ بووم
لە هاتف دەنگێ هات و عاشقی بووم
وتی بێ واوە مژدەت (باغی فیردەوس)(*)
بەهەشتە مەسکەنت من ڕەهبەری تووم

***

(*) لە دەستنووسەکەدا لەسەر دەستەواژەی (باغی فردەوس) نووسراوە (١٣٤٧) واتە مێژووی کۆچی دواییی ئەو خوداڵێخۆشبووەیە. وەکو ئەوەی لەو نیوە دێڕە شیعرەدا وتراوە (بێ واو) پیتی واوی لێ دەرکەین و بەڕێنووسی کۆنی بنووسینەوە دەبێتە (باغ فردس) کە دەکاتە (١٣٤٧)ی. ه و (١٩٢٨/١٩٢٩)ی. ز... (ت).

## مزی بێگانە

خوا دەیزانێ ڕۆڵە دەردەداری حاڵ و باڵی تۆم[*][1]
ئەبەد نایێتە بیرم زەڕەیێ تەدبیری ماڵی خۆم
کز و مات و مەلوول و سەر فڕۆ و حەیران و سەرگەردان
لە دەردی تۆیە لاوازم پەرێشانم قەدەم بوو کۆم
بەدەس بەدخواهەکانی بێ فەڕی خۆمانەوە سووتام[2]
نیشانگای ئیفتیرا وو غەیبەتم هیچە دژوون و لۆم
لە بیری کاروباری تۆ پەشێو و مات و داماوم
پەرێشانم وەکو تۆ، چۆن پەرێشانی بەنێزەی ڕۆم
نەتیجەی خزمەتی بێگانە وایە ئاخری دیتت
مزی بێگانە وایە خۆت بسووتێنی ئەگەر وەک مۆم
برا ئەو زوڵمە بێ ئەندازەیەی دوژمن کە کردی لێت
ئەگەر سەد یەک ئەوەش کەی لێت قبووڵ ناکا خەڕات و دۆم
خوایە تورکی بەدبینی دڕندە مەحوی بەڕکەی
بکەی جێ شارەکانیان بۆ ئێمە باغات و شۆم و تۆم[3]
مەڵێ کوردە (ئەسیری) غافڵە لەم ڕۆژە تاڵەی من[4]
خودا دەیزانێ ڕۆڵە، دەردەداری حاڵ و باڵی تۆم[5]

---

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٧٩
(١) لە چاپی (م. ع)دا (بار و حاڵی تۆم).
(٢) لە چاپی (م. ع)دا: بەدەس جل خوارەکانی بێ فەڕ و بەدبینەوە سووتام
(٣) ئەم دێڕە لە دەستنووسەکەدا نووسراوە، دواتر هێڵێکی بەسەردا کێشراوە.
(٤) لە چاپی (م. ع)دا (لەو ڕۆژە تاڵەی تۆ)
(٥) لە چاپی (م. ع)دا (بار و حاڵی تۆم)



## ئەی دۆتەی شۆخی وەتەن

ئەی دۆتەیی شۆخی وەتەن، دڵخواهی ڕەنگ و ڕوویی تووم[*]
ڕۆحی ڕەوانم بمرمیش[1] ئیللا لە باوەشت دەنووم[2]
دەستی لەملتایا ڕەقیب، چۆن بوو وەها بۆی بووی فریب
فەوتام لە داخی تۆ عەجیب، زەققووم ئەنۆشم زەهر ئەجووم[3]
شەو تا بەیانی نانووم، دولبەر برینداری تووم
لە کردەوە و کارم بووم، ئەم بیرە چبکەم بۆتە خووم[4]
ئەو وەختە عیشقت کەوتە سەر، لە جێ وو ڕێم بووم دەربەدەر
ئەی نیشتمانی خۆشەویست بۆ تۆ ئەوا[5] ئاوارە بووم
گیان[6] لە باوەشت دەر ئەچێ، بۆ چیمەنی فیردەوس ئەچێ
ڕەنجت لەبیرم دەرئەچێ، گەرمە بۆ ئەوسا ئارەزووم
دولبەر بەعەشقت دەمکوژی، پاش مردنیشم دەمگوشی
دەستت لە ملما دەمژی، ڕەحمەت دەنێرن گەل لە دووم

---

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٧٦ - ٧٧
(١) چاپی (م. ع): بشمرم
(٢) لە دەستنووس و چاپی (م. ع)دا: (ئیللا لە باوەشی تۆ دەنووم)، لەبەر کێشی شیعر کردمانە (ئیللا لە باوەشت دەنووم).
(٣) چاپی (م. ع): زەهروجووم.
(٤) چاپی (م. ع): لەم بیرە...
(٥) چاپی (م. ع): بۆ چاری تۆ...
(٦) چاپی (م. ع): ڕوحم
- لە دەستنووسدا: گیانم... ئێمە لەبەر کێشی شیعرەکە کردمانە (گیان)

وا خۆشەویستیت[7] بوو بەغەم، جەرگ ئاگر و چاو پڕ لەنەم[8]
بیرت لەسەر هیچ[9] نابێ کەم، لاوازە گیانم زەردە ڕووم
بۆ تۆ ئەوا ڕیسوا بووم[10]، تاکم لە عالەم جیا بووم
دێوانە وو شەیدا بووم، دنیایی پڕ کرد هایو هووم
بۆ تۆ (ئەسیری) بوو بەپەن، دایم بەبەد ناوی ئەبەن
ئەی دۆتەیی شۆخی وەتەن، دڵخواهی ڕەنگ و ڕوویی تووم

***

(۷) لە دەستنووسدا (وە خۆشەویستت)... ئێمە کردمانە (وا خۆشەویستیت...)
لە چاپی (م. ع)یدا: (دەخۆشە دەستت بۆ بەغەم،...)
(۸) لە چاپی (م. ع)یدا: چاو پڕ لە تەم.
(۹) چاپی (م. ع): لەجیاتی (هیچ)... (تەن).
(۱۰) چاپی (م. ع): بۆ تۆ ڕیسوا بووم...



## کفنمە ئەم مێزەرە

سەبر و ئارامم نەماوە، تەنگ و تاریکە دڵم[*]
ئەم لەشەم پووکە وەکو، کا سووکە مەڕوانە زلم
بیری خاک و گەل[1]، کەس و کۆمەڵ وەها کەوتۆتە سەر
ڕاستیی باوەڕ بکە ئامادەیی شیرە ملم
هەر کە بیستم ئەو سەرۆکانە[2] بەناهەق بوون شەهید
تووشی ڕۆماتیزمە[3] بووم ئەی ڕۆڵە ئێستا وا شەلم
کفنمە ئەم[4] مێزەرەی وەک لنگەدەستارە و زلە
پەتمە بۆ هەڵواسرانم هەرکە مردم، کەلپەلم
خۆم بەزیندوو ڕۆح لەبەر نازانم ئەی لاوی عەزیز
وا دەزانم بۆ تۆ کوژراوم لە ڕێگەت پەل پەلم
گەر بەئاگر بمسوتێنن کوردم و کوردم دەوێ[5]
کوشتیی خاکی پاکمم، قوربانی خزمانی گەلم
ئەی (ئەسیری) خاکی پاکت پێت دەڵێ خوێنت بڕێژ
دا ببێتە لالە وو ڕەعنا وو نەسرین و گوڵم

***

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/۲ - ل/۳۲ بەناوونیشانی (تەنگ و تاریکە دڵم).
(۱) چاپی (م. ع): خاک و گڵە...
(۲) چاپی (م. ع): ئەو ڕەئیسانە...
(۳) چاپی (م. ع): ڕۆماتیز
(٤) چاپی (م. ع): کفنەکەم، ئەو...
(۵) ئەم دوو دێڕە شیعرە (واتە چوار نیوە دێڕەی ماوەتەوە) لە چاپی (م. ع)یدا نییە.

## هۆشەنگ

چبکەم لە جیهان و خۆم نەزانم
سوودم لەمەیە، کە دەرچێ گیانم
لەم تێ نەگەیینە ڕەنجەمانم[1]
دەردێکە نەزانی پیاوی هۆشیار
کەیف و هەوەسە نەزانی بێهۆش

***

ئەم چشتە بەتاڵە پڕ لە گۆیە
تاریکییێکە نەبا نە گۆیە
کۆتایی ئەگەر هەبێ لە کۆیە
ئەو هیچە وەها وەها هەر ئەڕوا
یانە لە وەلا جیهانی تر دێ

***

لەولاتری ئەم جیهانە چی دێ
دیسانەوە هیچ و چشتی دی دێ
هیچ و لە وەلا جیهانی دی دێ
کۆتا نییە یێک لە دووی یەک ئەڕوا
بیرم لەمە تێکچووە و کەشەنگم

***

لەو دیو و لە پشتی ئەم جیهانە
دەڕوا، نییە بۆ بنی نیشانە

(١) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (دەرچو گیانم) دواتر کراوەتە (ڕەنجە مانم).



چشتێکی وەهایە کەس نەزانە
گەرچی ئەمەیە لە نویسی هۆشەنگ
هۆشم لە ئەمەش بوو پێچەوانە

***

بێتو ئەگەر ئەم جیهانە بڕوا
کۆتایی نەبێ، وەها وەهادا
ئەستێرە وو مانگ و خۆر و پڕ با
لەم کارە وڕ و نەزان و گێژم
ئەم بیرە لە کێشی من نییە دەبەنگم

***

## سەید ئەحمەدی خانەقا

خوانی میوانی دیتبا حاتەم

سەرفرۆی شەرم ئەبوو دەشیگرت ماتەم

نە لە دەرگا و خوانی میوانی

بەسترا بێ لە گوفتی خۆرشی کەم

هیچ نەوترا بەهیچ میوانێکی

لێرە چەن ڕۆژە، خۆرشی چەن ژەم

لەشکری شاه و جیایی میوانی

جاڕی ئەم ناکرێ بەزیر و بەم

دەنگی بادەی شیرینی زێڕینی

وا زرنگا شکانی جامی جەم

بەزوانانی ڕۆژهەڵات هەرکام

گوفت و گۆی دایە زایە، ڕایەدەم

گەر بپرسن لە مامەزا و خزمی

گشت پڵنگی چیاو شێری چەم

هێزی گوفتی لە مەژگی گوێ دێری

ڕوون و ڕووناکی بەخشە هەر وەک شەم[1]

هێندە ژوور و بڵند و بێباکە

بۆ جیهان ناگرێتە دڵ هیچ غەم

(١) وشەکە بەباشی نەنووسراوە، وەکو (پەم - یان - چەم) دەخوێنرێتەوە، ئێمە بۆ ڕێکیی واتا کردمانە (شەم)... واتە: مۆم، چرا.



بەسیە پشتی (پەیامبەری) واسا

شاه و سەرداری باغەکەی (ئیرەم)[2]

چاکی سەید ئەحمەدی خانەقا ئەسیری

نییە توانات (ئەسیری) بگرە دەم

***

(٢) لە دەستنووسەکەدا بەمجۆرە نووسراوە، دواتر گۆڕاوە و کراوە بە:

ناردرا بۆ پەری و مەردوم هەم.

وشەی ناو کەوانەکە لە دەستنووسەکەدا تەنیا پیتی (م) ماوەتەوە و دیارە، ئێمە بەوشەی (ئیرەم)مان زانی.

## دەردی تۆرانی

پێشوو و ئێستەم پەرێشانی بوو، ئاهو دەرد و غەم
جێگە وو دەورم لەبەر فرمێسکی چاوم بوو بەنەم
ئاگری سینەم بەفرمێسکم گڕی دانامرێ
داغە جەرگی ئاگرینم زەهر ئەنۆشم دەم بەدەم
گەرچی وەک ئاسک لە بێستانی وڵاتم گەشت ئەکەم
فائیدەی چی هەر وەکو ڕێوی گرفتاری تەڵەم
کەوتمە دەریایی داگر دەردی بێ پایانی تۆ
ڕۆڵەیی کوردم نەجاتم چۆن ئەدا مەرگە مەلەم
چوار سەد ساڵ بوو لە بۆ تۆرانییان ڕەنجت ئەدا
وا بەناهەق دەتکوژن بۆ تۆیە ئاه و وەلوەلەم
ڕووت و قووت و برسی وو بێ عیلم و جاهیل مایتەوە
تێگەیشتووی میللەتت سینەی بووە کانی ئەلەم
بێ بەشی عیلم و مەعاریف، سەنعەتن تۆرانییان
لاکن ئوستادی جیهانن هەر بەفیشاڵ و بەدەم
چەرکەس و کورد و عەرەبیان خستە دەردی ئەرنەود
بۆ خۆیان ماوەتەوە دنیا سەروژێر بێ چ غەم
گەر بنووسی کردەوە و بەدخوویی تۆرانییان[1]
ئیکتیفا ناکا (ئەسیری) قاقزی دنیا و قەڵەم

***

(١) لە دەستنووسدا پێشتر بەهەڵە نووسراوە (ئێرانییان)، دواتر ڕاست کراوەتەوە و کراوەتە (تۆرانییان).



ن

## کیژ و ژنان ٢

گەر هەرایێ بێ لەناو کوردستان[*]
یاریدەی پیاوان ئەدەن کیژ و ژنان
سەنگەر ئەگرن، شەڕ ئەکەن، مێرد و کوڕان
نان و ئاویان بۆ دەبەن دایک و کچان
یەک لە پیاوان لێ درێ، ژن زوو بەزوو
دەیڕفێنن، دەینێنە سەرکۆڵ و شان
دایکەپیرە زامەکەی تیمار ئەکەن
دەیبەنە دێ بۆ نەخۆشگەی دیدەوان
بۆ ئەوەی پیاوان هەموو بۆ شەڕگە چن
وا دەبینی دۆتەیی شێخ بۆتە شوان
کیژی ئاغا و بەگ بەلەنجە و لارەوە
خۆی لە ناچاری دەبێتە باغەوان
وا کناچەی، ڕیش سپیی گوند و مەلا
یەک لەسەر بێستانە، یەک ساوە لەوان
هەرچی کاری کوڕ بێ، کچ سازی ئەکا
تا لەبەر دوژمن نەبن تەنگا و، ئەوان
شەڕ کە هاتە دەس بەیێخە و قایمە
جێ دەمێنێ باغ و ساوە و کەپر و ڕان

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە، ب/١ - ل/٥٥ - ٥٧

مێیینه بڕ بڕ بۆ جێی شەڕ ڕا ئەکەن
نابێ لەو چاخە لە هیچ کەس ترسی گیان
خوێش و خەڵک و مێرد و خێزان پێکەوە
تێدەکۆشن هەر وەکو خوشک و بران
تا وەکو دوژمن شکست ئەخوا تەواو
شەڕ ئەکەن بڕ بڕ ئەدەن هەوڵ و دەوان
هەر کە دوژمن سەر فرۆ بوو، شاد ئەبن
پیاوەکان دیل ئەگرن و، تاڵان کوڕان
ئافرەت زامدار و کوژراو خڕ ئەکەن
کاکە وو ڕۆڵەی شرین و بابیان
لەم شەڕی شێرانە چۆن سەرکەوتوون
نابیستێ هیچ کەس گرین و دەنگیان
شادی وو بەزم و زەماوەن، هەڵپەڕین
هەر لە ئێوارە گڕ ئەدرێ، تا بەیان
ئەی (ئەسیری) میللەتێ وا بێ ژنی
تێبگە ئینجا چلۆنە پیاویان

***



## شەدەلار

بەسیەتی مردم نەما ئارامی دڵ، تۆزێ وچان
بێرەوە دیدارێ بنوێنە شەهی کوردستان
خوێنی دڵ وەستا لە یادی دووریی ڕووت، لەش سووتا
ئارەزووی دیداری تۆی بوو هاتەدەر، بێچارە گیان
دڵ بەدیدارت دەلەرزێ دەست و پا کەچ، وەک زوبان
هەی شەدەی لارت پتر سامی لەسەد تاجی کەیان
شەو بەهیوایی سبەی دیداری ڕووت بێدار ئەبم
ڕۆژ بەئاواتی نیگارت هەر لە ڕەنجام و دەوان
بێ مەسیح ئاسا نیگاهێ کە بەلایی چاوەوە
دا کە مردوو زیندەبێ بەدواوەیی ڕووحی ڕەوان
بێ، بینایی چاوەکانم چوو لە تاوی چاوە چاو
بەندی جەرگ و دڵ لە بێ ئارامی جەڕران و پسان
بێرەوە بڕوایی من، هەر تۆی مەبەست ئیمانەکەم
بۆ لەمن زویری دەزانی بێ وەیە کردەی نەزان
هۆ (ئەسیری) کام ئەواتت هاتە دی، یارت دەوێ
دەرد و ڕەنج و داغی دڵ بوو سەربەسەر بۆ تۆ ژیان

***

## بەخێرچی(*)

بەخێرچی خۆشەویستی کۆمەڵ و هیوای گەلی کوردان
کە تۆی تێدا نەبی هەڵبەت بەتاڵە دائیرە و دیوان
ئومێدم وایە زوو جێگەت و ڕوتبەت وەزارەت بێ
نەکەی شک هەر ئەوێنە جێگەتە ئەی خاوەنی عیرفان
تەحەممول ناکرێ یا بێرەوە یا ئێمە بێین بۆ لات
وەکو تۆ نابێ هەرگیز ئەو کەسەی وا دێتەجێ بۆمان
زوانی حاڵی کەرکووک بانگی کرد فریاد ڕەسیوی تۆ
لە تونانا دەخنکا ئاویانت دا وەکو باران
بژی بۆ شاری بێکەس هەر بژی بۆ میللەتی بێ هێز
بژی ئەی ناسراوباب نەریمان و کەسی سامان
هەزارانێ لە سایەت کاری فەراهەم بوو
ئەوەن هەر ئەم (ئەسیری) دەردی کاری ئەو کرا دەرمان
لە خواوامان ئەوێ پایەت بلندتر بەرز و باڵا بێ
هەتا دنیا ئەمێنێ هەربژی ئەی موحتەرەم بۆمان

---

(*) بۆمان ساغ نەبۆتەوە کە ئەم شیعرەی لە بەرێکردنی کام پیاوی لێپرسراوی کورددا وتووە، بەڵام وا دەرئەکەوێ لە کاتی بەرێکردنی مەعرووف جیاووکدا ئەم شیعرەی وتووە.

لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/١- ل/ ١٢٠



## ستایشی بابە عەلی بەرزنجی(*)

ئەی نەورەسی غونچەی ڕەزو باغی گەلی کوردان
هیوای دڵ و (وەی) موفتەخەری قەیرەو و لاوان
ئەی ساحیبی فیکری حیکەمی و کەللەیی پڕ هۆش
ئەی دائیرەیی مەرکەزی موڵکی شەهی بابان[1]
ئەی تازە نەمامی چەمی شیرینی سمایل
ئەی لالەیی بەرپراق و گەشی چیمەنی عەدنان
ئەی نوتفەیی پاکیز و گوزیدەی شەهی مووسڵ
ئەی ڕۆڵەیی قۆچاخی عەلی شێری یەزدان
ئەی تەرزی درەختی تەڕ و سەبزینی حوسەینی
ئەی عەرعەری دەسنێژ و وەچی دوانزە ئیمامان
ئەی گەوهەری بیزەرخ لە بەرزنجەیی یەکتا[2]
ئەی باعیسی ژین و ئەمەلی گەورەیی کوردان
پێی ناوێ بکا مەدحت (ئەسیری)، وەکو ڕۆژی
ئەی سەروەری گەل، بابە عەلیی مەنبەعی عیرفان

---

(*) لە دەسنووسێکی لای خۆمانەوە وەرگیراوە.

(-) لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/ ١- ل/١١٧

(١) ئەم دێڕە شیعرە لای مامۆستایان شارەزا و جەباریدا بەشێوەی خوارەوە نووسراوەتەوە:

ئەی ساحیبی فیکرو حیلم و کەللەی پڕ هۆش
ئەی دائیرەی مەرکەزی موڵکی شەهی بابان

(٢) وشەی (بیزەرخ)، لەو دێڕە شیعرەی سەرەوەدا، هیچ واتاییێکی ڕوون نابەخشێ. ڕەنگە لە ئەسڵدا (بیدرخ = بیدڕوخ) بووبێت واتە (بیی ڕەنگ) واتە (گەوهەری سەوزی بیی ڕەنگ)، یان (بیزەرق) بووبێت، واتە (ڕەسە و بەبەها).

# کەس نەناس ئەمڕۆ

ڕۆژ و شەو ویستنم لە خوای یەزدان
بەزەیی بێ بەمیللەتی کوردان
لە توانایی دووری نابینم
موشکیلی کاریان بکا ئاسان
سەرفرۆی تۆین و، تۆ بەفریاکەوە
یا کەریم و ڕەحیم و، یا ڕەحمان
بتەوێ شاری وێرانە ئاوایە
بتەوێ ئاوەدانییە وێران
کە لەهەت کردەوە بە پۆڵۆنیا
کوردیش هەڵبەت ئەکەیتەوە ساسان
بچە سەفا ڕەعیەیی تەنها
ناتەسەر موڵک و تەختی شای ئەفغان
هیچ نییە کوردی کەس نەناس ئەمڕۆ
بکەیە شاهی میللەتی بابان
ئێمەشت چونکە کردە ئادەمزاد
بدە پێمان ئیدارەیی ئینسان
تیپ و سەرباز و لەشکری جەنگی
بەئیرادەت پەیا بێ دەوڵەتمان
تیغی بەدخوا گەیشتە سەر ئێسک
جەرگ و دڵ وا سووتا، بووە بوریان
دڵی پڕ دەرد و، ڕەنگی زەردی کورد
گەورە وو گچکە مات و سەرگەردان



بچییە هەرچی ماڵ و کۆمەڵی کورد
نابینی بێجگە ناڵەو و گریان
بەبەشەر هیچ نەما ئومێدی کورد
جێی ئومێد تۆی گەورەیی گەوران
ئەی (ئەسیری) بەسە هەناسەی سەرد
ڕۆژێ دادێ هیوات ئەدا یەزدان

***

## مەعرووف جیاووک

شەش برا هەن، شێرزاد و کوردەوەند و کوردەوان
بو دوارۆژی گەل و نیشتمانی کوردن پاسەوان
ئەو نەمامێ ئێستە دەیچێنین بەرەنچ و ژانی دڵ
بۆ گەیینو بەرز و بەردانی ئەمانەن باغەوان
بابیان مەعرووف جیاووک هەر کە ناوی کوردی نان
پێگەیین، پەروەردەیی شێران ئەزانی شێرەوان
گەورەیان سەر دەستەیان ناوی (نەریمان) ژیریان
بانگ ئەوازی کارییە، پڕ مێشکی هێز و تەوان
ئەو تری (سامان)ە ناوی خۆشی سامانی هەیە
هۆش و تێبینیی هەیە شۆخ و شرین و نەوجەوان
سێیەمین (سۆران)ە بۆ سۆران بەسالاری ئەشێ
چاخێ بێ ئێستاکە هیوایی بەنرخە بۆ ئەوان
چوارەمین (بۆتان)ە پێنجەمیان (ژیان)ە هەر بژین
خۆشەویستی کوردەوانن هەردوو وەک گیانی رەوان
ناوی بەرز و توند و برندەی شەشەمیانە (جوکوڵ)
ساوەیە هێشتا خەریکی کاری پاکژیی زوان
با بژی مارف جیاووک چونکە بارانی هەیە
بەخششی یەزدانە زندە هەر بەبارانە بۆ وان
هۆ (ئەسیری) رۆڵەیی کوردانە مایەی ژینی تۆ
چونکە هیوایی دوارۆژت نییە بێجگە ئەوان

***



## دەم پەرستی وەتەن و...

نیشتمانێکم هەیە دڵبەر و سەر پشکی جیهان
لە جیهانا هەیەتی ناوی[1] خۆش و ناوونیشان
بەدرەخت و گوڵ و گوڵزار و رەز و باغ و چەمی
دۆتەیی شۆخ و قەشەنگە، گەش و رەنگین و جوان
فەری چین چینە لەسەر یەک وەکو زوڵفی دولبەر
داری بەرزی بەری، ژێری لەوەڕە و ئاوی رەوان
رووی زەویی وایە، بنی زیو و زەڕ و جیوە و نەوت
بستەجێییێکی نییە تیایا نەبێ گەنج و کان
ئەسەلی زیرەکیی گەل خۆشی و پێکەوتەیی خاک
لە گەوای ئەم وتەیە کورد کە نەیگۆڕی زوان
گەر دروست بوایە پەرستیی جگە خوایی یەزدان
دەمپەرستی وەتەن و، دەمگوت خوامە نیشتمان
تاکو ماوم هەموو پێویستییەک و خۆراکم ئەدا
هەر کە مردم دەچمە باوەشی دەستم لەملان
ئەی (ئەسیری) لە سەرت چاکەیی زۆرە وەتەن[2]
تۆش رەوایە بۆ ئەوەی خۆت کەیە کوشتی، قوربان

***

(١) پێشتر نووسراوە (ناوی) دواتر کراوەتە (بانگی).
(٢) وەتەن: دواتر کراوەتە (وەتەنت).

## ئالامی[١]

کەسبی عیلم و مەعریفەت کە، سەرکەوە وەک میسرییان[*]
نەک وەکو میسری بژی، وەک عارەبی ئیسپانییان
ئەندەلوسیش هیچ نەبوو، من وام ئەوێ زۆر سەرکەوی[٢]
سەرکەوە وەک دەوری مەئموونی شەهی عەبباسییان[٣]
وەک ئەوانیش هەر بڵند بە، تا لە دنیا دەرکەوی
هەر وەکو باپیرە گەورەت، میللەتی[٤] ساسانییان
سەرکەوە تاکو لە عالەم دەرکەوی وەک ماهی تاب
هەر وەکو باپیرە کۆنت، دەوڵەتی ئالامییان[٥]
ڕۆڵە ئەم دەوری بڵندی[٦] وا لە ئەورووپا هەیە
ئەورووپای فێر کردووە، غەرناتە و ئەشبیلییان
عەکسی بەغدا[٧] بوو، کە سەنعەت ئەندەلوسیش فێر ببوو
دەوڵەتی بەغداشی فێر کرد، عالمی ساسانییان

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/٢ – ل/٤٣ بەناونیشانی: (هەڵکە بەیداخی درەفشی کاویان).
(١) ئالامی: ئیلامی.
(٢) چاپی (م. ع): ... من وام ئەوێ نەو سەرکەوێ.
(٣) چاپی (م. ع): سەرکەوە وەک دەوری مەئموون، پادشای عەباسیان
(٤) چاپی (م. ع): دەوڵەتی.
(٥) چاپی (م. ع): ئیسلامیان...
– ئالامییان = عیلامییان.
(٦) چاپی (م. ع): تورەقی... (دەبێ تەرەققی بێ)...
(٧) چاپی (م. ع): ئەورووپا



دەوڵەتی ئاسوور و بابل عیلم و عیرفانی نەبوو
میللەتی کلدانی فێر کرد دانەری ئالامییان[٨]
لاوی من تۆمی بڵندیی نێژتووە باپیری تۆ[٩]
هەڵسە سەر پێ، هەڵکە بەیداخی درەفشی کاوییان
باسی[١٠] حاڵی کۆنە پیاوانت بڵێ بۆ لاوەکان
ئەی (ئەسیری) زیارەتی گۆڕت[١١] دەکەن وەک حاجییان

***

(٨) چاپی (م. ع): دەوڵەتی ئیسلامیان.
(٩) چاپی (م. ع):
لاوی من توخمی تورەقی نێژتووە ئەجدادی تۆ
(١٠) چاپی (م. ع): باس و
(١١) چاپی (م. ع): قەبرت.

## کیژ و ژنان ١

ژنانی کوردی ئێمە زۆر بەکارن
لە ڕۆژی جەنگ و هاوارا سوارن
لە کار و کردەیی خانوویی خۆیان
سوبوک دەستن لەگەڵ پیاویانا یارن
لە هۆنین و چنینا گشتی وەستا
لە دوورین و بڕینیشدا سەلارن
لە لایێ تەون ئەکەن، لاکێش ئەهۆنن
لە لایێ خورج ئەهۆنن بێستارن
بەڕەو جاجم ئەکەن، ڕەنگی بەنیشی
لە هۆڕ و تێڕ کردن، بێژمارن
هەنێکیان کۆچ ئەڕانن، موو ئەڕێسن
هەنێکیانش خەریکی جێ هەوارن
لە ئاوایی نەبێ سەردار و کوێخا
لە خزمەت کردنی میوان لە کارن
ئەگەر تەدبیری بۆ کارێ لە دەس بێ
لە گفتوگۆیی کۆمەڵ (حیصصە)دارن
لەسەر ئەم کار و کردە، کیژی کوردان
بەناموسن بەئادابن، بەعارن
کچی شێخ و سەرۆک و دەوڵەمەندان
لە خوێنین و نووسینشدا دیارن
چنینی سنگەوانە و، دەستەوانە
پوشین و گۆرەویی کیژانی شارن
لە کوردستان نەمێنێ پیاو (ئەسیری)
لە پێکهێنانی کاری، ژن بەکارن



## الله اکبر(*)

ئەی برا[1] مەڕوانە ماڵ و خانەیی وێرانی من
تێبگە زانین و فەن و کردەوە و عیرفانی من
ڕۆڵەیی کوردم، سیلاحشوورم[2] لەمەیدانی شەڕا
عالەم ئەیزانێ چلۆن بوو ڕۆستەمی مەیدانی من
گەر بڕۆی گەشت و گوزاری باغ و باغاتم بکەی
تێدەگەی ئەوجا چلۆنە جەننەتی عەدنانی من
سەیری کێو و دامەنی کێوانی کوێستانم بکەی
هەر دەڵێیی الله اکبر چەن خۆشە سەیرانی من
ئاوی بەرماوەی منە نیوەی جیهان تێر ئاو ئەکا
بۆ عیراق و ئەلجەزیرە ڕۆحە ئەم ئاوانی من
مەزرەعە و کێڵگەی ولاتم بۆتە عەمباری جیهان
ڕزقی ئێران و عەرەب تەئمین ئەکا خەرمانی من

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع) ب/٢-ل/ ٢١-٢٣دا بەناونیشانی ڕۆڵەی کوردم بڵاوکراوەتەوە (م. ع) لە پەراوێزدا دەڵێ: لە دەستنووسەکەی لای ئێمەدا سەردێڕی ئەم هۆنراوەیە نووسراوە "کابرا مەڕوانە"، لە کتێبەکەی مامۆستایان شارەزا و جەباریدا نووسراوە "ڕۆڵەی کوردم" ئێمەش ئەم سەردێڕە بەپەسەندتر ئەزانین. لە گۆڤاری (بەیان) لاپەڕە (١١٥) کانوونی دووەمی ١٩٨٦ لاپەڕە (٣٧)دا بڵاوکراوەتەوە، جیاوازی لە نێوان شێوەی دێڕە شیعرەکانی لەگەڵ شێوەی سەرەوەدا هەیە و چەند وشەیەک گۆڕاوە.

(١) لە چاپی (م. ع)دا: کابرا مەڕوانە.

(٢) سیلاحشوور: واتە: چەکدارێکی نەبەردم (جەنگاوەرێکی نەبەردم) (م. ع).

بۆ بلّندیی خۆی بەقوربانی ژیانی گەل دەکا
گیان و مالّی هیچە لا، سەرکردە وو گەورانی من
ڕووبدا بۆ دین و میللەت زەڕەیێ کورتی و بەدی
گیان ئەدەن ناکەن تەحەممول عالیم و شێخانی من
ئەو کەسە بەدبینە ئیسپاتی جەهل بۆ خۆی ئەکا
وا ئەکا ئینکاری زۆر و دەبدەبە و دەورانی من
لاپەڕەی تەئریخی عالەم شاهیدە بۆ دەوری من
دیارە هێشتا تاقی کیسرای دەوڵەتی ساسانی من
ئیددیعای عیلمی مۆسیقا ئاهی من ئیسپات ئەکا
ڕاست و سێگا وو بەیات و لاوک و حەیرانی من
دیزە وو بێژنگ و تەشپی، پەستەک و شاڵ و کلاش
شاهیدە بۆ کردە وو کاری دەسی کۆنانی من
دەبدەبەی جەمشید و داراو و فەرەیدوون و کەیی
قابیلە ئینکاری عەدلی شاهی نەوشیروانی من
خێڵی دەوری ئەنقەرە و عێلاتی سەرکەی بایەزید
چاخی دنیا گرتنم بوو ما لەوێ کوردانی من
میسر و یۆنان و یەمەن، هیندستان و تورک و ڕۆم
چۆن موسەخخەر بوو بەگورز و خەنجەر و چەوگانی من
ئەی برا ئەو قەومە ژوورەی شوهرەتی سوریانییە
هەر ئەوە گۆڕاوە لەفزی میللەتی سۆرانی من
حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێن ئاسوورە، ئاغا سوورییە
بەم وتە کوردە، دیارە سیلسیلەی عەدنانی من[۳]

(۳) ئەوەی زانراوە"قحطان"باپیرە گەورەی عەرەب بوو،"عدنان"یش لە "مستعرب"ەکان بووە، واتە بەپێی شیعرەکەی ئەسیری بنەچەی "عدنان"کوردە.(م. ع)



حەزرەتی نوعمانی سابیت بوو حەنیفەی سەرمەزەب
کوردە خاوەن عیلمی بەحری بێ پایانی من
پیاوی وەک سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبیم بووە
فەخرە بۆ ئیسلامی عالەم، کردەوەی سوڵتانی من
ئینقیلابێ چۆنی پێکهێنا لە ئیسلام و عەرەب
میر ئەبو موسلیم بوو سەرکردەی گەلی شێرانی من
نادری ئەفشاری وو عەبدولکەریم خانی زەنی
دوێنێ دەنگی دا لە عالەم سەتوەتی شاهانی من
گفتوگۆیا ئینتیهای بێ، خاتیمەش بێ بەم وتە
نیسبەتی ئاری بەسە بۆ عەنعەنە و عینوانی من
مەسلەکی من هەر چەنێ لەم تەرحە[٤] بەحسە دوورشە
ئەی (ئەسیری) پێم دەڵێی میللییەت و ویژدانی من[**]

***

(٤) ئەم وشەیە لە سەرەتاوە لە دەستنووسدا بە (لەم تەرحە)نووسراوە، دواتر کراوەتە (لەم جۆرە).

(**) گەلێک جیاوازیی وشە و دێڕ و شتی دیکە لە نێوان دەستنووسەکەی لای (مامۆستا گیوی موکریانی)دا کە ئەوەی ئێرە دەقەکەیەتی و چاپەکەی (م. ع)دا هەبوو نەمانویست لەمە پتر پەراوێزەکان بارگران بکەین.

## ژەپۆن[1]

پڕ دڵم دەردە برا دەردێکی چۆن[*]
دارِزاوە دڵ سەرم کاسە لە بۆن
ڕۆڵە ئەم داماوییەم بۆ خۆم نییە
ماتەم و ڕەنجم لەبەر دوارِۆژی تۆن[2]
سەیری ژەپۆن کە چلۆن سەرکەوتوون
دوێنێ هەستاون لە خەو ئەمرِۆ لە کۆن
کارگەری هێندە زیادی کرد لە وان
ڕووسەکان[3] ئەمرِۆ لە بۆیان سەرفرۆن
کەشتیی[4] سەرپۆشراوی ئاسنین
وەک نەهەنگی ژێری دەریا پێی دەڕۆن[5]
وا لەسەر دەریایی (داگر) بەرز ئەبن
دەفرِن و پەرواز ئەکەن هەر وەک هەڵۆن

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/١ – ل/٦٩ – ٧٠
(١) ژەپۆن: ژاپۆن، یابان.
(٢) چاپی (م. ع): ماتەم و ڕەنجم لەبەردا ڕۆژ بتوون
(٣) چاپی (م. ع) و پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (ڕووسەکان)، دواتر لە دەستنووسدا کراوەتە (چین)، ڕەنگ بێ ئەمەیان ڕاستتر بێ، چونکە ژاپۆن (چین)ی گرتبوو نەک ڕووسیا...
بەڵام لەبەر کێش دەبووایە بکرێتە (چینەکان) نەک چین... (ت).
(٤) چاپی (م. ع): گشتی.
(٥) چاپی (م. ع): بێ دەروون.



کەشتیی پۆڵای زرێداری زەلام
چەن نەهۆمە، وەک قەڵا کرداری خۆن
(کان) یان هیچی لە ژێر خاکا نەما
گشتیان دەرخست و دەفرۆشن بەتۆن[6]
کردەیی کاری ئەوانە پڕ جیهان
کەلپەل و بەللوورییات و ڕۆنی بۆن[7]
بەم هەموو سەرکەوتنە و کار و بەرە
دینیان ئێستاکە هەروا دینی کۆن
هۆگری یەک بوون و بۆیە چوونە ژوور
هیچ نەیانگوت من هەم و ئەو بێ چڵۆن
بیری قەیرە و پیری تۆکەڵکی نییە[8]
لاوی من نیشتمان و گەل چاونۆڕی تۆن
قەیرەیە گەرچی (ئەسیری) ساوە بوو
خۆش خوانت بوو لە شاهۆ وو لهۆن[9]

***

(٦) چاپی (م. ع): بەموون.
(٧) چاپی (م. ع): ڕۆن و بۆن.
(٨) چاپی (م. ع): پیر و قەیرە و بیری کۆکەڵکی نییە.
(٩) چاپی (م. ع): قەیرەیە گەرچی «ئەسیری» سادە بوو
خۆشخوانییت، بۆ لە شاهۆ و لهۆن

## شادە گەلت

لەشم لە خاکتە، گیانم میوانتە وەتەن
مستێ لە خاکی تۆ نادەم، بەهیند و چین و خوتەن
ڕووبار و مێرگ و گولّ و چیمەن و چەمی
کانیی شرین و باغ و ڕەز و سێبەر و سەهەن
خۆشویستنت وەها بەسۆزە، کە کاری لە کەللە کرد
ئاگر لە دلّ بەر ئەدا، جیا ئەکا لەسەر بەدەن
وا هەر خەریکە دوژمنی کۆنت بەڕۆژ و شەو
بۆ بن بڕینی میللەتی کوردت بەباو و بەن
ئەی نیشتمان ئەوانەی ڕەقیبی تۆیان دەوێ
وا تێمەگە بەشەربن، ئەوانە شەوەن
ئەی لاوی سەرفرازی گەلی کوردی دەردەدار
شادە گەلت،گەشە ڕەنگ ڕوونە، ئێوە هەن
کۆشش بکەن بەدەست و پێو قەلّەم و چاو و دەم
بێ شوبهە زوو بەزوو بەهیوای خۆتان دەگەن
لەم ڕێیە هەرچی بەلایێ بێ گوێ مەدەنێ
یا مردنە و یا نەخۆ هیوایە پەک مەخەن
ڕۆژێ بەئارەزوو دەگەن و شار و خوڕەم ئەبن
وەلێ بەشی ئەسیری سێ پاو و پەت و کەفەن

***

## تەشەککورنامە

«تەشەککورنامە بۆ مەبعووسە موحتەرەمەکانمان جەنابی سمایل بەگ و، جەمال بابان و، سالّح بەگ و، حازم بەگ و، سەیفوللّلا بەگ و، محەمەد بەگی جاف و، پیاوە بەغیرەت و حەمییەتمەندەکانمان».

شەش مەردی نیشتمانی لە شەش گۆشەیی وەتەن
ئێشک گرن بەگیان و بەدلّ هەولّ و ڕەنج ئەدەن
بۆ سەرفرازی وو دواڕۆژی ڕوونی گەل
کۆشش ئەکەن بەپەلەو نووسین چۆن و چەن
ژینی ئەمانە لە خوایی گەورە خوازمە
دووربن لە حیزە فێلّی بەدخواهو باو و بەن
سەر دەستەیە سمایلی سۆران، جەمال بەبان
نەوزادی پژدەرە سالّح بەگی جەوەن
حازم کە ناوی حازمە، کردەیشی حەزمییە
سەیفی خودایە کەللەی پڕ هۆش و عیلم و فەن
بێتو کەسێ بلّێ چلۆنە (حەمەد) بەگ دەلّێم:
سەرداری جافە نایەوێ گوفتار و نوونیشەن
پێشکەش ئەکەم سوپاسی گەلی کورد و خۆم
بۆ پێشڕەوانی، بۆ هیوا کە ڕێ ئەبەن
گیانی ئەبەخشێ کورد لە ڕێی ئەم کەسانەدا
چاوەنۆڕیانە بلّێن چی وەها ئەکەن
ناوونیشانیان دەمێنێ (ئەسیری) هەتا وەکو
ڕۆژێ جیهان بمێنێ، تۆ پیاوی لە ڕووی وەتەن

***

# ئێمەش ئەولادی ئادەمین

ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین[*]
لە مودیر و ئیدارە بۆ چی بەرین؟!

***

ئەم غەم و دەرد و حەسرەتە تا کەی؟
داغی ناو جەرگی لەت لەتە تا کەی؟
ئەم وەڕس بوون و میحنەتە تا کەی؟
نێڵەیی خەڵک و باری میننەتە[1] تا کەی؟
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیدارە بۆ چی بەرین؟!

***

ئەوەی هۆشی هەبێ لەماتەم و حوزنە
نییە بۆ کوردی بێ نەوا جەژنە
بۆچی نایێتەدی (قەرارەکەی لوجنە)؟
گەورەو و بچکە[2] بۆ ئەوە توشنە
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیدارە بۆ چی بەرین؟!

***

پیاومان عالیم و مەرد و بێ پەروا
تاکە نیشتمانمان لە ئاب و هەوا!

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/٢ - ل/٤٠ - ٤٢
(١) لە چاپی (م. ع)دا: (میحنەتە).
(٢) چاپی (م. ع): گچکە



میوەیی باغی بۆ جیهان ئەڕوا
فائیدەی چی؟ بەقوڕگی خەڵک ئەڕوا!
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیدارە بۆ چی بەرین؟!

***

تێبگە ڕۆڵە چۆن بوو پێشوونان
حوکمی میدیا و عەدلی نەوشیروان
قووەتی ئەردەلان و، بەخششی بابان
ئێستە بۆ ملکەچین و سەرگەردان؟!
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیدارە بۆ چی بەرین؟!

***

کەسێ هەیە وا لە گەل بەجێ مابێ
وەکو ئێمە لە پاش و دووا مابێ؟!
بێ وەزیر و ئەمیر و، بێ شابێ
هەیە (ئایەت) کە کورد بەهیچ نابێ؟
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیدارە بۆچی بەرین؟!

***

موددەعیی خادمی بڵندی بەشەر
کردیان گشت بەخاکی ئێمە گوزەر
تێگەیین حاڵی کورد و، باس و خەبەر
ڕەحمێ ناکەن لە میللەتی بێ سەر

ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیداره بۆ چی بەرین؟!

***

سەیری کوردێ بکەی لەسەر تا پای
هەر لە تەپڵە، هەتا وەکو کاڵای
کردەیی خۆیە سنعەتی باوای
ئەی (ئەسیری) حەقە بکەی داوای
ئێمەش ئەولادی ئادەمین بەشەرین
لە مودیر و ئیداره بۆ چی بەرین؟!

***



## ئەی نەوەی کورد

ئەی نەوەی کورد، ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و، خەوی سەنگین
لە دەمێکی نەهات و ڕۆژی ڕەشین
ئاه ئەکێشین و دڵ دەگوشین
دەردی دڵ هێندە زۆرە وا دەهەژین
بەرخۆری باخی ئێمەگەل لە خۆشین
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین
تێ بنۆڕین لە کاری خۆ، کوردان
گەل پەرێشان و نیشتمان وێران
گەوره و گچکە مات و سەرگەردان
بێکەس و بێ پەناو دڵ بوریان
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین
تێ بنۆڕین لە میللەتانی دی
چۆن دەژین سەربەخۆ لە ڕووی زەوی
خێوی سەرباز و دەوڵەتانی قەوی
بێجگە لە کورد کێ لە پاش و خوار و نەوی
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین
ئەی کەسی بێکەس و پەنای هەژار
بەزەییت بێ بەکورد خوا هاوار

وا وەڕس بووین لە گیان لەلەش بێزار
مووچەمان ئاخوداخ و دەرد و ئازار
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین
گەل نەماوە کەشەنگ و وڕ ئێستا
گشتی وریا بووە و لەخەو هەستا
خۆی لەجێی ڕاوەشان و ڕاوەستا
سەربەخۆ و ڕێک ئەژین هەموو ئێستا
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین
دەوڵەمەنمان خەریکی خۆراکە
لاتمان گیانی تیا نییە و لاکە
سەروەری گەل، (ئەسیری) بێباکە
پۆلی زانایە، دەردی هەر خاکە
ئەی نەوەی کورد ڕۆڵەی شیرین
بەسیە بێهۆشی و خەوی سەنگین

***



## ماتەمنامە

ڕەش دەپۆشین، شیوەنە کوردین لە مانگی ماتەمین[*]
ڕۆژی قورپێوانە ئەمڕۆ مێزەر و سەرپۆشە شین
ساڵ بەساڵ ئەم ماتەمە دەگرین لە بیرمان دەرنەچێ
تا زەمانی تۆڵە دێ ڕۆژێکی وا خوورەم ئەبین
شێخ عەبدولقادر و چەن سەد ڕەئیس و، شێخ سەعید
لەم دەمە بوونە فیدایی نیشتمان و گەل، دینی موبین
شێخ عەبدولقادر ئەم زوڵمە گرانەی لێ کرا
دیارە ئەرشەد بوو لە ئەولادانی فەخرولمورسەلین
بۆ نەسووتێ دڵ، جگەر بۆچی نەبرژێ وەک کەباب
سەرکز و عاجز خۆمانین، دەردەدار و دڵ حەزین
بێ هیوا وو بێ پەناو و بێ بەش و، بێ جێ و ڕێ
گۆشەگیری ناعیلاجین، دوور لە خەڵک و بێکەسین
چەن هەزارێکمان بەسێدارە بەناحەق بوون شەهید
سەد هەزار کوژراومان ئێستەش لەسەر ڕوویی زەمین[١]
سەد ئەوەندە زوڵم هەبێ، دەردیش هەزاران بێتە پێش
هەر لەسەر ئەم بیرە[٢] وو ئەم ڕێگەیە سابیت ئەبین
مەرد ئەوە ماڵ و سەر و موڵکی لە ڕێی حەق دابنێ
ئەی ئەسیری هیچە لای عاقڵ بەنامەردانە ژین

***

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە، ب/٢ - ل/٦٨ - ٦٩
(١) چاپی (م. ع): زەوین.
(٢) چاپی (م. ع): فیکرە.

## له دەستەی پەهلەوین

ئێمە کوردین سەروەرین ئارین لەدەستەی پەهلەوین
سالکی ئەوجی سەعادەت، بۆ مەعاریف ڕەهرەوین
ڕۆژ و شەو هیوا لە کۆششمان مەبەست چاکی بەشەر
ڕەهبەری حوررییەتین عیلم و مەعاریف پەروەرین
تازە تەرزی نەو نەمامی باغی سەروی میللەتین
لالە وو ڕەیحان و نەسرین و بنەفشەی وەتەنین[1]
ئێمە پەرژینین لە دەوری خاکی پاکی نیشتمان
دەستەیی میحنەت کەشی گەل، پاسەوانی میللەتین
عیلم و زانایی چەکی دەسمانە، وەحشەت دوشمنە
مەحوو بەربادی ئەکەین، یەغماگەری عەمری ئەوین[2]
ڕوو لە هیوا ڕاست و تیژ و دەیدەوان و ڕەهڕەوین
عیلمێکی وا کەسب ئەکەین بۆ ئاسمانان پێی ئەچین
ڕۆژهەڵاتی لاوی کوردانە (ئەسیری) زوو وتی
ئێمە کوردین سەروەرین، ئارین لە دەستەی پەهلەوین

***

(١) لە دەستنووسەکەدا لە پێشەوە بەو جۆرەی سەرەوە نووسراوە، دواتر کراوەتە (...بنەفشە و یاسەمین).

(٢) ئەو نیوە دێڕە پێشتر بەو جۆرە نووسراوە، دواتر کراوەتە: (... ئەو دوژمنە کۆنەی بەرین).



و

## جگەر برژاو

دڵ لە دووریت تواوە بوو بەزووخاو
ئاگری جیایی جەرگی سووت وەکو قاو
چۆن نەبرژێ لەشم لەسەر تا پا
گڕپەیی ڕووت بەگڕترە لە هەتاو
سەیرەکارم لە دووری ڕووت ئەسووتێم
لەش بەدیدار وەکو جگەر برژاو
خۆری دیداری ڕووت، کە بنوێنی
تێک ئەچێ کاروباری زیندە وو[1] ماو
بێنە مەی هیچ مەڵێ شێخە نانۆشێ
بۆ مەلاش بادەنۆشی بۆتە باو
کێبێ تووشتبوو، تووشی دڵداریت
کە نەبوو بێ بەگەشکە پیر و لاو
جۆری گوڵزاری ڕووت کە ئەینوێنی
بوونی بەرجا، نەچۆتە بیری زاو
ئەو برسکان و، ئەو بڵێسەی ڕووت
ئەوە هیوا نە لێو و کوڵم و چاو
هەرچیی گرت ئەو بڵێسە، بوو بەنەچیر
ئەوە چەکتە، بەوی ئەکەی کەسێ ڕاو

(١) لە پێشدا لە دەستنووسەکەدا وا نووسراوە، دواتر کراوەتە (مردوو).

دڵبەریی خۆشەویستە دڵ بەدیلیبێ
بەبێ ناوبانگ و ناونیشان و ناو
هۆ (ئەسیری) چییە، لە کێ ئەدوێی
دیارە بەختت ڕەشە و ئەواتت خاو

***



## نیشتمانت وەک بەهەشتە

ڕۆڵە کۆشش کە بجووڵێ ڕۆژ و شەو(*)
با نەمێنێ ڕاحەتی و خۆراک و خەو
ڕۆژی پێویست خۆت بکە قوربانی گەل
گەر لە کۆمەڵ کەوتە بەر تۆ ڕیز و دەو
پف لە کوورەی سینەیی لاوت بکە
ڕۆژهەڵاتی گەل بڵێ گۆرانی ئەو
لەم هەوارگەی باو و باپیرت مەڕۆ
دابمەزرێ وەک چیا، زۆر تاڵە ڕەو
بیری هەر چیت بوو لە دڵ بیشارەوە
بێ بەر و بێ جێیە دەنگ و قاوەقەو
هەرچی کاری ئاشکارە لێی بدوێ
ڕۆڵە پێک نایێت و بەرخۆر نابی لەو
نیشتمانت وەک بەهەشتە چیمەنی
تیا دەخوێنێ پۆڕ و بولبول، قومری، کەو
دانەوێڵەی چارەوات و خۆت ئەدا
گەندوم و نیسک و برنج و نۆک و جەو
ئامەدی زۆرە و بەهاتە جێیی تۆ
باویە ڕاو، (شامپانیا) ناگا بەئەو
ئەی (ئەسیری) کوشتەی خاکی پاکتی
هەر بڵێ تا دەتکەنە قوربانی ئەو

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/١ – ل/٤١ – ٤٢

## ستایشی پێغەمبەر ((د . خ))(*)

یەزدان لە ئەزەلدا هەبوو وەک خەزنەیێ گومبوو
ویستی کە دیاری بێ، ئیرادەی بەخەلق بوو
نەوعی بەشەری، خوا، مەدەنی خەلق و پەیاکرد
قورئانی بەدەستووری عەمەل بوون ڕەواکرد[1]
ویستی کە موبەلیغێکی شایستە لە خۆیان
بۆ ڕوحی موحەممەد، دەستەگوڵی ڕەحمەت و ڕەحمان
چونکە لە بەشەر لایق و پاکیزە هەر ئەو بوو
بۆیە لە خوای گەورەوە ئەو نائل بە بەشەر بوو
دەرکەوت سەبەبی حیکمەتی خوا ناردنی ڕەهبەر
بۆچی بوو موحەممەد لە بەشەر بوو بەپەیامبەر

(*) لە دەسنووسێکی (ئەسیری)یەوە وەرگیراوە. (م.ع).
(-) لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە، ب/١- ل/ ٨٩
(١) مەبەس لە نیوەی یەکەمی دێڕە شیعرەکە ئەوەیە کە خودا ئادەمیزاد و شارستانیەتی دروست کرد و پەیدای کرد. (م.ع).



## خوا هەبوو(*)

خوا هەبوو لە کۆنا هەر هەبوو
بێجگە لەخوا کەسی تر نەبوو
هەرچی کە هەیە خوا پەیدای کرد
دا خۆی بناسن بۆیە ئاوای کرد
ئاسمان و زەوی پەیداکرد
گیانلەبەرو درەختیشی کرد
لەپاش ئەمانە لە خاکی زەوی
ئادەمی پەیداکرد تەنها، بێ وەوی
کە دی لایەکی وا هەڵزەپیوە
ئەم لاکەی تری بۆخۆی تەپیوە
لا هەڵزەپیوەی هەر بەرزەوە بوو
کاتێکی زانی زۆر گرژەوە بوو
لێی جیاوەبوو وەکو خۆی لێهات
خۆی نێربوو ئەویش وەکو مێی لێهات
بوونە مێرد و ژن هەردوو یەکیان گرت
بۆ جەنناتولعەدن ڕێیان لەبەرگرت
لە بەهەشت دەگەڕان بەکەیف و خۆشی
میوەیان ئەخوارد مەییان ئەنۆشی
لە هەنگوین و شیر لە ئاوی کەوسەر
شەراب و قۆنیاخ وەک میسک و عەنبەر

(*) لە دەستنووسێکی «ئەسیری»یەوە وەرگیراوە. (م.ع)
(-) لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە- ب/١- ل/ ٨٥- ٨٦

بۆ ژیانی هەموو پەڕەندییێکی
دەهاتە پێشێ بۆ تیکەییێکی
ئادەم لە بەهەشت کە هاتەخواریێ
گەیشتە دونیا کردی هاواریێ
کە دی زەوی بەدار و بەردی ڕەق
نزیک بوو لە قینا دڵی بکا تەق
ئەمەی بەسەرهات لەبەردەمی بوو
لە ژووری دەمی پشتی چەمی بوو
شێوابوو عەقڵی وەک ئاو ئەلەرزی
هاواری ئەکرد بەدەنگی بەرزی
دەمم بوو ئەمەی بەسەرم هێنا
بەهەشت بوو جێگەم ئەو دەرمی هێنا



## بەخێرهاتنی ڕەشید عالی گەیلانی(*)

هەرکە بۆ ناو قەومی کورد هاتی بەمیوانی ئەتوو
ئیلتیفاتت هێندە زۆر بوو، ئارەزوویان گشتی بوو
ئەی وەزیری موحتەرەم، ئەی سەروەر ئەی نامدار
عەدلە نیشانەو شیعارت، چاکە لێتان بۆتە خوو
کورد کە نۆسەد ساڵە ڕەبتی خانەدانی ئێوەیە
ئیمڕۆ زیاتر موخلیسن چونکە لەتۆیان دیوە ڕوو
چونکە مەیلی چاکە ئەکەی حوککامتان عادیلن
باوجوود حوککامی کەرکووک ڕازین لێیان گەل هەموو
چاوەنۆڕی فەیزی لوتفی تۆ ئەکەن لەم ڕۆژە وەک
هەروەکوو باران دەسا بێت ئەمری شەریفت، دە زوو
چەژنە پیرۆزەی جەنابتی بەناوی قەومی کورد
ئەی وەزیری سەربڵند و زۆر زۆر بژی لەو پایەیە توو
موخلیسی دەرگاهی گەیلان (ئەسیری) بانگ بکە
چاوەڕێی فەیزین لەتۆ، هیممەت بکە گەیلانی زوو

(*) لە دەسنووسێکی لای خۆمانەوە وەرگیراوە. لە کاتی هاتنی ڕەشید عالی گەیلانیدا بۆ کەرکووک خوێندراوەتەوە. لە کتێبەکەی مامۆستایان شارەزا و جەباریدا بڵاوکراوەتەوە.

(-) لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/١- ل/ ١٢١.

# چوومە کوردستان

چوومە کوردستان لە چاخێ گەرمی وو سەرما نەبوو[*]
بەرگی شیو و شاخ و، دەشتی سونبل و ڕەیحانە بوو
بۆ هیلاکیی گەشتی دەوری پایتەختی شای بەبە
جێگە مۆڵەم چەند ڕۆژێ شاری خۆشی بانە بوو
ڕۆستەم خان و حەمەخان پێک بەشەڕ هاتن لەوێ
چەند کەسێ کوژراو، چەندی دێ سووتا و وێرانە بوو
دڵ لەوێ هەڵکەندرا، ڕووم کردە ڕێگەی گردی خان
دەنگی پۆڕ و قومری وو بولبول لەوێ مەستانە بوو
چوومە ئەو دیوا، گەییمە میرە دێی دەشتی سەقز
بانگیان کردمە قەڵاتێ تەرزی نەوکاشانە بوو
نۆکەر و میرزا وو خانم، هاتنە دەورم هەموو
باسی جەنگی بانەیان پرسی، وەلێ ئاغا نەبوو
هەر کەبیستیان لێم شکستێکی تەواوی حەمەخان
تێکچوو ئاغاژن بەیەکجار، گفت و گۆم پێ چا نەبوو
میرزایێ پێی وتم وسکت بە ئاغاش لەو شەڕە
خوشکی حەمە خانە، خانم، چا بوو ئەو وریا نەبوو
خانمی دێ هاتە گفتوگۆ، وەلێ گوفتی چلۆن
هەر کە تێ نۆڕیمە بیر و هۆشی، سوقراتانە بوو
(ئەربەبا) و ڕێی (هەنگەژاڵیان) گەر بگرتایە وتی
ناشکان بەم جۆرە، پیلانێکی بسمارقانە[1] بوو

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٣١ - ٣٦

(١) چاپی (م. ع): بسمارکانە بوو.



بانگی میرزاییێکی کرد، نووسراوی بۆ جێییێ نووسی
تا نووسی چەند جاری پێ گێڕاوە، هەر پێی چانەبوو
خۆی کە دەستی کردە تەقریری بەپەهل و پارسی
من لەجێی خۆم مات بووم، میرزاش لەوێ دێوانە بوو
تێ گەییم ئەوسا کە مێشکی پیاو و ژن فەرقی نییە
هەر کەسێ تەئریخی زانی، بیری ئەو مەزنانە بوو
بۆ سبەینێ کەوتمە ڕێ تا چوومە ناو شاری سەقز
جێگەیێ ئاودار و دڵگیر و خۆش و جانانە بوو
چەند ڕۆژێ مام لەوێ ڕووم کردە مەنمی و تیلەکۆ
چوومە دێی میرزا میراشە جێگەیێ شاهانە بوو
چوومە دیوانی حەبیبوڵڵاخانی تیلەکۆ
چەن مەلا و سەرهەنگ لەوێ بوو، کۆمەڵی پیاوانە بوو
گفتوگۆمان هاتە سەر نووسینی زانایانی کورد
کەوتنە کێشە لەگەڵ سەرهەنگ، ئەو (زانا) نەبوو
فارسی و خەتتی شکستی ئێوە نازانن وتی
مێشکی لەق بوو، وتەی بێ تام و مەجنوونانە بوو[2]
فارسی و خەتتی شکستمان بۆ چییە؟ کوردیی پەتی
بۆ ئێمە نووسینی چاکە وتمە ئەو، وریا نەبوو
تاکو ئێستا هیچ نەنووسراوە بەکوردی چۆن ئەبێ
خوێندن و نووسینی پێشوونانی ئێوە وا نەبوو
لەو سەری دیوانەوە خێزانی خان هاتە جەواب
زۆر بەسەر سەرهەنگدا هات و، وتەی بێجا نەبوو

(٢) ئەم دێڕە شیعرە (دوو نیوە دێڕ) لە چاپی (م. ع)دا نییە.

میللەتانی دی (مەلائیک) فێری نووسینیانی کرد
یا لە (تەورات) و لە (قورئان)، یانە ئیلهامانە بوو
تێ گەیین وتێگەیاندن، بۆتە هیوایی نووسین
من بەکوردی زۆر ئەنووسم، ڕەئیی تۆ نادانە بوو[٣]
بەم وتەی خانم قوڕی دایە دەمی سەرهەنگدا
مات بوو ڕەش(ڕەش)[٤]داگەڕا نوقمی کوپەی خومخانە بوو
پاش گەڕانی هەیبەت و (گەلباغ) چوومە ناو (سەراڵ)
چوومە ماڵی سەید عەلی چاخی توو و شیلانە بوو
سەید عەلی هۆشیار و زانا وو بەدڵ وریا و مەن
ڕووخۆش و کار و وتەی سەرکەوتوو و گەورانە بوو
حورمەتی گرتم شیلانە و توو و سێب و[٥] خوانی هات
دەس لە خۆراکا بوو[٦]، گفتوگۆ و شەڕە شیعرانە بوو
نۆرە کەوتە بەرمن، هەڵبەستێکی خۆمم خوێندەوە
زۆر تەڕ و خۆش و شیرین و، ناسک و یارانە بوو
زۆریان پێ خۆش بوو هی کێیە ئەمە؟ هی من وتم
کوێندەریی کێی کوردەیم، کۆمەڵ بەوە ڕەندانە بوو[٧]

(٣) لە دەستنووسدا بەمجۆرە نووسراوە
چاپی (م. ع) ڕەئی تۆ نادانا نەبوو...
دەبوایە (لەبەر کێش و واتا): (ڕەئیت نادانانە بوو) بوایە... (ت)
(٤) لەبەر کێش ئێمە (ڕەش)ی نێو کەوانەمان بۆ زیاد کرد.
(٥) چاپی (م. ع): سین... ڕەنگە هەڵەی چاپ بێ.
(٦) چاپی (م. ع): بە
(٧) چاپی (م. ع): کوێندەری کێی کوردە؟ پێم کۆمەڵی بەرژەندانە بوو



سا کەوایە چەندێ[٨] هەڵبەستی بەهەشتی شێخ ڕەزا
لێرە فەرموو، جێگەمان ئەمڕۆ بەتۆ شاهانە بوو
هەر کە خوێندم هاتە جونبوش پیاو و ژن گەورە و بچووک
خانمیش چەن شیعری شێخی[٩] خوێندەوە مەستانە بوو
پاش ئەوە هەڵبەستی نیشتمانی و گەلیی خۆی خوێندەوە
مێشکی پیاوی ئاو ئەدا، بەو جۆرە میللییانە بوو
لەو دەمە هاتینە سەر گوفتی پێشوویی ئەردەلان
باسی تەئریخیانی کرد، زانینی ئوستادانە بوو
زۆر عەجایب ئەلفییەی مەتنی سیووتیشی لەبەر
خۆمنیش جامیم ئەخوێنی تێگەییینم وا نەبوو[١٠]
بۆ سبەینێ زوو لە شەرما[١١] کەوتمە ڕێ بۆ سنە
چوومە شاری سینە، باغی سەیری سینەما نەبوو[١٢]
هێندە ڕۆژێ دەردەچوومە گەشتی دەوری چیمەنی
ئاوی ڕوون و مێرغوزار و قەسری فیردەوسانە بوو
جارێ تووشی دەستەیێ ژن بووم لەگەڵ ئاغا حەسەن
ڕابووردنمان بەلایانا بەناچارانە بوو

(٨) چاپی (م. ع): سا کەوا بێ چەن...
(٩) چاپی (م. ع): خۆی.
(١٠) چاپی (م. ع): تێ گەییم پێوانە بوو
(١١) چاپی (م. ع): لەوێ وە...
(١٢) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (سەیری باغی) دواتر (سەیری) ڕەش
کراوەتەوە و لە دوای (باغی)یەوە نووسراوە...
چاپی (م. ع): شاری سنە.

یەک لەوان هاواری کرد، فەرموو فەقێ چایێ بخۆن
شەرمشم هات[١٣] و کە سەیرم کرد مەستوورانە بوو
هەر کە دانیشتین هەموو ڕوویان نیقابی پێوە بوو
یەک لەوان مۆرێکی کەن، نادر لە بەسرە وا نەبوو
من وتم بۆ چی ژنیش دەتوانێ حەککاکی بکا؟
ئەو تری وتیان سەعات سازە، کچێ قەیرانە بوو
ئەو تریشیان (لەوحە) نویسێکە[١٤] وەکو چاپە خەتی
چالێنەر گۆیندە[١٥] بوو، ساقی ژنێ ڕەندانە بوو
دەستیان کردە موعەمماو و لەغز پرسینەوە
هەر خواخوام بوو نەجاتم بێ، وەلێ ڕێگا نەبوو
مێزەری مەلا کە دەرکەوت، زوو بەزوو هەڵسایین لەوێ
چونکە مەلا ڕەخنە گیر و[١٦]، گەورە وو مەندانەبوو
پاشی چەن مانگی[١٧] تری چوومە ڕەوانسەر سەیری کەم[١٨]
خان و مانی[١٩] ئەردەلانی هیچی دی هیوا نەبوو
هەر کە چوومە (سەڵتەنەتگە)، حاکمی حەمیدە خان
ئافرەتێ سەردار، ڕەشید بوو، خۆی لە دیوانا نەبوو

(١٣) چاپی (م. ع): کرد
(١٤) چاپی (م. ع): نووسێکە
(١٥) چاپی (م. ع): گۆبەندە بوو
(١٦) چاپی (م. ع): ڕەخنەگر بوو...
(١٧) چاپی (م. ع): ڕۆژی
(١٨) چاپی (م. ع): سەیرەکەم
(١٩) چاپی (م. ع): خانەدانی



چوومە کۆمەڵگە سەلامم کرد و وتیان سەد عەلێک[٢٠]
پڕ لە مەلاو و لە نووسەر، کۆمەڵی زانانە بوو[٢١]
فەرموو ئاغای سەیید ئەو ژوورە بەخێر بێی خەڵکی کوێی؟
هەر کە زانییان[٢٢] کەرکووکیم، باسی شیعر یێکانە بوو
چەندی هەڵبەستێکی شێخی خوێندەوە خانم بەخۆی
من کە هەڵبەستێکی خۆمم خوێندەوە هاوتا نەبوو
بێژەنانی گشت ئەناسی، خۆشی بێژەن بوو کەمێ
چەن هەزار بێژی لەبەر بوو، نووسەری گورجانە بوو
حاکمێ بوو حوکمی وەک باپیرەگەورەی ئەردەلان
تێگەیشتوو و مەن بوو گوفتی، ڕێک و دانە دانە بوو[٢٣]
پاشی چەن ڕۆژێ لەوێوە چوومە دەشتی شارەزوور
نووسراوی عادیلەم دی ڕێک و دڵدارانە بوو
ئەم گەڕانەم بیست و دوو ساڵی لەمەو پێش بوو تەواو
لەو دەمانە، ڕۆژهەڵاتی پیاو و ژن وریا نەبوو
ئەی (ئەسیری) ئەم ژنانەت دیوە وریا بوون لەوێ
پیاویان نیوەی وەها بوو، ڕەهبەرێکی وا نەبوو

***

(٢٠) چاپی (م. ع): ... کرد هەموو وتیان علیک
(٢١) چاپی (م. ع): زانسانە بوو
(٢٢) لە دەستنووسدا: زانین
(٢٣) چاپی (م. ع): دانانە بوو

## ستایشی محەممەد ئەمین زەکی بەگ(*)

هەرچەنێ هیوام هەبوو یەک یەک لە دەستم گشتی چوو
هیچ مەبەستێکم نەما بۆ پاشەڕۆژم بێجگە توو
هەرچەنێ بیری بلـّندم کردو بەخت یاری نەدا
پشتیوانێکم نەبوو جێگەی ئومێدم هەو نەبوو
ئێستا تەنگاوم لە دەست کورتی ئەوا چارەم نەما
گەرچی لەم جۆرە ژیانە بوومە چەرمی ئاوەسوو
خێرخواهان سەرنوبسی مەحکەمەی شەرعییەیان
بۆم نوبسی داکو رزگاربم لەدەس تەنگی بەزوو
چەند سالێ نووسرا جاخ جەمال بۆم بوو بەشەش
دامەدوواوە (نووسرا سەرنۆ بدە) وەک ئارەزوو[١]
با بەهەشتیشی لەسەر، ئەو چەندە پێم گوفتێ درا
پێکی بێنن ئێوە بۆم بۆ ئێوە چاکە بۆتە خوو
وا لەبەردەرکی وەزیرێکی ئەمێن و هەم زەکی
تاکە دەروێشە (ئەسیری) بانگ ئەکا یا پیر هوو

(*) لە دەسنووسێکی (ئەسیری)یەوە وەرگیراوە. (م.ع)
(-) لە چاپی (م.ع) یەوە وەرگیراوە ب/١- ل ١١٢
(١) ئەم دێڕە شیعرە لە کتێبەکەی مامۆستایان شارەزا و جەباریدا نووسراوەتەوە:
(چەند سالێ نووسرا چاخی جەمالم بوو شەست)
(نامەداوا نووسرا سەرنووبدە وەک ئارەزوو)
ئاشکرایە لەو سالانەدا کە ئەسیری ئەم شیعرەی هەڵبەستووە تەمەنی نەگەیشتۆتە شەست هەتا بلێ: چاخی (جەمالم) بوو بە شەست. (وشەی نامەداوا) هیچ مانایەک دەرناخا. بەلام (دامە دواوە) واتە گەڕامەوە بۆ دواوە. (م.ع).



## بۆ عەبدولڕەحمان بەگی تاپۆ(*)

عەبدولڕەحمان بەگی تاپۆ دڵەکەم، گەرچی چوو
تەنگ مەبە شوکری دەوێ پایەیی ئەو، بالا بوو
هەموو کەرکووکی سەراسەر لە خودا پێویستیان
ئەمەتا، پایەیی بەگ بەرزەوە بێ بێتەوە زوو
چاکەییێکی پێتە بێجگە لەمە نازانی
کردەیی بابییە ئەم کارە لەمیش بووگە بەخوو
سەیری هەڵکەوتی سەری کەی، مەخزەنی عەقڵ و زەکا
سەیری روخساری بکەی پرتەوی فرینی لەڕوو
میللەتێ ژوور ئەکەوێ دەوڵەتی هوشیاری هەبێ
دەوڵەتێ هێزی ئەبێ پیاوی هەبێ سەرکەوتوو
هەموو پیاوانی حکوومەت وەکوو ئەم بوونایە
لە جیهان تاک ئەبوو ئەم دەوڵەتە هاوتای نەبوو
پایەو چاکەی پیاوێ کە نەیزانیبێ گەلی
چ نموودی نەبووە ئەو گەلە هەرماوە لە دوو
زۆر سوپاسی ئەوێ هۆکاکی (ئەسیری) بۆ بەگ
پایەیی بەرزەوە بوو گەرچی لە کەرکووک لاچوو

(*) لە دەستنووسێکی لای خۆمانەوە وەرگیراوە. عەبدولڕەحمان بەگی تاپۆ: شاعیرێکی نوێخوازی ناسراوە...
لە چاپی (٣-ع)یەوە وەرگیراوە ب/ ١- ل/ ١١٨

ۆ

## تۆڵە نامە

ڕۆڵە بڕوانە لە کردەی دوژمنی غەدداری[1] تۆ[*]
ڕۆژی دانایی لە تاڵان کردن و کوشتاری تۆ
شێخی پالۆ و نەهرییە کوژران بەسێ پا بێ خەتا[2]
خۆی ئەوا بۆ کوشتنی تۆش ساز ئەدا خوێنخواری تۆ
ڕەنگی نیشتمانت بەخوێن کرد بۆتە قاڵی دوژمنت
سووتەنیی تورکانە ئێستا ئێسکی نازداری تۆ
دەربەدەر بوون ماڵ و منداڵی شەهیدانی گەلت
چۆڵ و وێرانە سەراسەر ئێستە دێ وو شاری تۆ
هەر دەبێ مات و مەلوول و دەس بەئەژنۆ دانیشی[3]
هەر دەوامی بێ دەبێ ئاهو گرین و زاری تۆ
دەست و پێ هەڵکە بجوڵێ ئێستە چاخی تۆڵەیە
نابێ ئارامت هەبێ، گەر بۆ گەلت غەمخواری تۆ
پڕ لە چەک ئامادەبە تێ هەڵکە دەی بستێنە زوو[4]
تۆڵەیی گەورە و بچووک و ڕەنجبەر و دینداری[5] تۆ

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/٢ - ل/ ٣٠ - ٣١
(١) چاپی (م. ع): وشەی (غەدداری)ی لێ کەوتووە.
(٢) چاپی (م. ع): وەک مەسیح.
(٣) چاپی (م. ع): دانیشن.
(٤) چاپی (م. ع): پڕ لە چەک ئامادەیە، تۆڵە دەبێ بستێنی زوو
(٥) چاپی (م. ع): سەرداری تۆ.



تازە کێت ماوە لە خزم و ماڵ و منداڵ و کەست
ڕۆحێکی مات و کزت ماوە، لەویش بێزاری تۆ
ئاهی سەردی سینە وو سۆز و گڕی جەرگ و دڵت
هەر بەتۆڵە لا ئەچێ دەرد و غەم و ئازاری تۆ
چاخی فرسەت لێی گەڕان[6] پاشا پەشیمانی چ سوود
بۆیە بەر باد و پەرێشان بوو[7] گەلی دینداری تۆ
گەه بەسونگی، گەه بەگوللە، گەه بەبۆمبا دەتکوژن[8]
سەد دەخاڵەت کەی بەڕاستی کوشتەیی سەر سێداری تۆ
چەندی خۆت بۆیان بەکوشت دا، ئاخری سوودی نەدا
چونکە کوردی هەر لە چاویان بێ نموود و خواری تۆ
سەد هەزار منداڵ و کیژت دەربەدەر بوون و نەمان
وا لە دەس بێگانە دۆتەی[9] خۆشەویست و یاری تۆ
نیشتمانت چۆڵ و وێرانە، گەلت بوو دەربەدەر
دادەمەزرێ خێڵی بێگانەت[10] لە جێی گوڵزاری تۆ
ئەی (ئەسیری) ڕۆژێ وا دێ گەل بەحەققی خۆی ئەگا
لەو دەمە هێدی دەبێ ئێشی دڵی داغداری تۆ

***

(٦) چاپی (م. ع): لێگەڕان.
(٧) چاپی (م. ع): پەرێشانی بۆ...
(٨) چاپی (م. ع): (گاه)... لەجیاتی (گەه).
(٩) چاپی (م. ع): وا لە دەستی بێگانە دۆتەو...
(١٠) چاپی (م. ع): بێگانە.

## جێگای موقەددەسە

بۆچی ڕەواجی نییە کوردە کاری تۆ
چەن ساڵ و چەن عەیامە وەها چەوتە باری تۆ
تا کەی تەحەممولت هەیە بەم باری میحنەتە
نادا بەشەر بەمە مل بەرد و داری تۆ
چەن خۆشە سەرفرازی وو بوونت بەسەربەخۆ
نەت چەشتووە چوزانی چییە ڕۆڵە باری تۆ
عاشق بووم بەڕوخی دوختەری وەتەن
شەقبەی ڕەقیب، ئەمە نابێ بەیاری تۆ
یاری منە، شیرینی منە، دڵبەری منە
لاچۆ دەفع بە موفسید و غەدداری تۆ
لە خاکی ئەم وەتەنەم هەر دەبم بەخاکش
تۆ کێی؟ لە کوێوە هاتووی؟ ئەغیاری تۆ
بە زیندوویی و بە مردوویی پێم لازمە[1] وەتەن
جێگەی موقەددەسە نابێتە جێ مرازی تۆ
خاوە خەیاڵی تۆ، لەت لەت کرێم ئەگەر
نابم بەپەیڕەوی بیری مەککاری تۆ
خونخواری تورکی بێ وەفا نەکو بۆ من وەهای
هەروا بەدە لەگەڵ هەموو ئیسلام کاری تۆ
کوردم، (ئەسیری)یە لەقەب و شوهرەتم
وریا بووم ئیتر عەقیمە هەموو کاری تۆ

(١) لە دەستنووسدا سەرەتا وا نووسراوە (پێم لازمە) دواتر کراوە بە(پێویستمە).



## سنوور

کوردە دەزانی لە کوێ جێگرە[1] خزمانی تۆ[*]
گوێ گرە بۆتی بڵێم جێگەیی قەومانی تۆ[2]
کێوی تۆرۆس و عومقی حەوزەکەی ئەسکەندەروون
غەربییە تا بەحری ڕەش، سەرحەدی مەیدانی تۆ
بەحری ڕەش و ئەردەهان، ئاوی ئەراسە بزان
حەددی شیماله ئەمە بۆ کۆچ و جەولانی تۆ
ئەڵوەن و گۆلی ئورمێ، تا سەری ئاوی ئاراس
سنووری[3] ڕۆژهەڵاتە جۆگەو و کێوانی تۆ
ئەهواز و کێوی حەمرین، ژەنگار و ڕێی نسەیبین
سنوورە بۆ جنووبی باغچە وو باغانی تۆ[4]
لە ناوی ئەم سنوورە[5] دوانزە ویلایەت هەیە
دەڵێن دوانزە ملیۆنە نفوسی کوردانی تۆ
حاشا درۆیە وترا[6] نفووسیان نەنووسرا[7]
دەگاتە بیست ملیۆن[8] بنووسرێ قەومانی تۆ

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٤٥ - ٤٦
(١) چاپی (م. ع): ساکینە
(٢) چاپی (م. ع): گوێ گرە تا پێت بڵێم مەسکەنی قەومانی تۆ
(٣) چاپی (م. ع): سەرحەدی
(٤) چاپی (م. ع): بۆ تەرەفی جنووبە ڕەوزەی ڕیزوانی تۆ
(٥) چاپی (م. ع): داخیلی ئەم حدودە...
(٦) چاپی (م. ع): ئەسلا
(٧) چاپی (م. ع): نەنووسراوە
(٨) چاپی (م. ع): ملیۆنان

لەدەر[٩] بەئەم سنووره لە ئەنقەره و خوراسان
بلووش و ئەزەربەیجان، لەوێشە خزمانی تۆ
ئەی وەتەنی خۆشەویست ناوتم ئەوجا کە بیست
منداڵێکی ساوه بووم، دەبوومە قوربانی تۆ
وتەی ولاتی کورده، لەلای تۆ هەر وەک ویرده
(ئەسیری) ئەم حاڵەتە دەلیلی ئیمانی تۆ

***

(٩) چاپی (م. ع): لە دەری



## نەخشەجێ و پێناس و تەئریخ

تێت دەنۆڕم نەخشەجێیی ئەورووپا زانایی تۆ
نەخشەجێیی نیشتمانت بۆچی نابینایی تۆ
ڕۆڵە پێناست نییە بۆ خویندنی هی ئامەریک
دەست و بردێکت هەیە گورج و گەش و وریایی تۆ
جۆگە وو ڕووبار و گۆلی خاکی پاکی خۆت نەناس
شارەزایی بۆ براوی کینە وو هاوایی تۆ
لیت بپرسن تۆزێ نازانی لە تەئریخی گەلت
زانەری تاریکی[١] تورک و جەرمەن و غولیایی تۆ
نووسەری ناوونیشانەی کۆنە گەورەی گەل گەلێ
کەس لە زارت نابییێ ناوی سەره و باوایی تۆ
بەسیەتی هۆشت ببێ تا کەی بێ ئەم بەدبەختییە
کەس هەیە وا لا لەوەڕبێ میللەتی هاوتایی تۆ
نەخشەجێ و پێناس و، تاریکی گەلت پێک بێنە زوو
بێژە هەڵبەستی گەلی پێویستە بۆ هیوایی تۆ
ناوی گەورەی پێشوو و ئێستەت بزانە یەک بەیەک
بۆ بلندیت بەڵگەیە نیشانەیان بێ لایی تۆ
کورتییێکت دی لە کاری گەل بلێ تەکمیل ئەبێ
ڕاستی هێزی هەیە، کاکی (ئەسیری) ڕایی تۆ

***

(١) تاریک: تەئریخ.

# زوانی ئادەم

بەکوردی بوو زوانی ئادەمی باپیرە گەورەی تۆ[*]
هیمالایا بوو جێگەی دەشتی هیندستان و قۆڵۆمبۆ
جریوەی کوردی زۆرە گەر بپشکنی وتەی هیندی[١]
لەبەر داگیری بێگانە وتەی تازی وو فارس گۆ[٢]
بپشکنی زوانی هەرچی ئادەمزاد[٣] هەیە ڕۆڵە
ئەدۆزی و خڕ ئەکەی چەن سەدهەزاری بێژی گفتەی تۆ[٤]
وتەی گۆڕاوە چەم شێتە ئەوەی جەمشیدی پێ ئێژن[٥]
نەمرد، نەمرووده هەردووکیان حوکمدارانی خزمی[٦] خۆ
بەلووش و کورد و ئەفغان و، ئێران و ئەرمەنی یەک بوون
بەڵخ بوو پایتەختی شاهی شاهانی قەدیمەی تۆ
سەراسەر هیندی وو خوارەزمی وو سوغدی و خوراسانی
ئەمانە ئامۆزاتن تازەکە خزمایەتی سەر نۆ[٧]
لە دایک و باوکی ئەفغانی، لەسینە بوو عەلی دەرکەوت
(غەزالی) سوغدییە ڕۆڵە، ئەمانەن فەیلەسووفی تۆ

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٥٨ - ٥٩
(١) چاپی (م. ع): لوغاتی کورد زۆرە گەر تۆ بنواڕی قسەی هیندی
(٢) چاپی (م. ع): لە تەئسیراتی ئیستیلا لوغاتی عەرەب و فارس و گۆ
(٣) چاپی (م. ع): ئادەمیزاد
(٤) چاپی (م. ع): ... چەن سەد هەزار لەفزی گفتەی تۆ
(٥) چاپی (م. ع): موحەررەف بووگە، چاو شینە، ئەوە جەمشیدی پێ ئێژن
(٦) نەمروود: شایەکی بەناوبانگە، شاعیر بە(نەمرد)ی ناو دەبا.
(٧) چاپی (م. ع): سەرلەنۆ



هەموو (ئەسلاو) و (یۆنە) و (جەرمەن) و لاتینییە ئاری
لە ئەوروپا[٨] مەغۆلی سێن، فینۆ و بولغار و هەنغارۆ[٩]
ئەوەی سوریانە سەنسکریتە[١٠] ئاریا، یانە خۆ ئاری
هەموو کوردن لە هەردەورێ بووە ناوێکی باوەی تۆ
ئەگەر ئارامی و کووسی[١١]، ئەگەر کرمانج و گورد و کورد
هەموو یەک تایەفەن ڕۆڵە، دەڵێ تەئریخی باوەی تۆ[١٢]
لە شاری سۆزەوە بۆ سەر فورات و دیجلە وو کاروون[١٣]
لەوێ ئارامیان گرتن (ئەسیری) خزمی کوردی تۆ[١٤]

***

(٨) لە دەستنووسدا: ئاری پا
(٩) چاپی (م. ع): لە ئەوروپا، مەغۆلی، دوو کەسن، بولغار و هەنغارۆ
(١٠) لە دەستنووسدا: سەنسقریتە
(١١) چاپی (م. ع): قیس
(١٢) چاپی (م. ع): قەومی تۆ
(١٣) چاپی (م. ع): قاروون
(١٤) چاپی (م. ع): لەوێ ئارامیان گرتووە «ئەسیری» قەومی کوردی تۆ

ه

## فێری عیلم بە

گوفتێکی وا دەڵێم کە بەکاری دین و دنیاتە
ئەی ڕۆڵە خۆشویستنی وەستا و مەلاتە
چاوت لە هەر چی جۆرە بڵندیی زەمانە بێ
باوەڕکە مامەوەسا[1] ڕەهبەرێکی گەوراتە
گەر بێ و بەئارەزووی دڵی بی بدا دەرست
ئەو دەرسە بۆ ژیان و ئاسوودەییتە، هیواتە
هەر چەندێ بتژیێنێ باب و داک خێوی لەشن
بۆگیان پەروەریت وەسا خێوێک قاتە
ئەو عیلمە چاکە، کە دەیخاتە مێشکت زانا
بۆ چوونی تاریکیی جەهلت، چرایی ڕۆشناتە
بۆ هەر چی دەوڵەت و گەلی بێگانە بێ سەفەرت
سەرمایە عیلمتە لە دەست، بۆ تۆ سەوقاتە
لێت خۆشبێ مامەوەسا ژێر ئەبیت و بەرخوردار
خۆشەویستی ئەوی ئەی ڕۆڵە خۆشەویستیی خواتە
تەئریخی میللەتتە کاری چاکی دەسی وەستا
گەوای ئەم وتەیە مانی تاقی کیسراتە
وا تێمەگە بەژیریی خۆت تێ ئەگەی بەبێ وەستا
ئەو خێو و گڕدەری چاپە لە مەژگی میناتە

(١) مامەوەسا: مامۆستا



وەستا نەوازشی لاوێکی بێ لە خووندن و کردە
بۆ چاخی پیر و دواڕۆژی ئەو ئەوا هاتە
ئەی ڕۆڵە گوفتی چاکی (ئەسیری) لەگوێ بگری
فیردەوسی گۆی بڵندی بڵندان جێگاتە

***

# نیشتمان

خۆشەویستیی نیشتمانت باعیسی ئیمانتە[*]
چۆڵ و وێرانیی وڵاتت مووجیبی[1] فەوتانتە
تۆزی ئەم خاکە عەزیزە، مەرهەمە و دەرمانتە
کەڵبەز و ئەشکەوتی کێوی، قەسرتە و ئەیوانتە

***

دۆتەیی شۆخ و قەشەنگە، ڕێک و ڕەنگین وەک وەوی
ناوی ئەم شیرین و شۆخەو نیشتمانە هەم زەوی
لاوی نەوجاهم دەهەستە، بۆ چی سەرمەستی خەوی
هی تووە ئەم نازەنینە، چاوەکەم تۆش هی ئەوی[2]

***

خۆش و دڵگیرە نموونەی جەننەتە کوردستان
بێشە وو شاخی بۆ میللەت، بۆتە باعیس فەخروشان
سەیری کەن لێی تێبگەن ئەم جێیە سینەمای جیهان
سەروەرانی گەل لە عیشقی خاکی وا هەڵواسران

***

سەر نەنێیە تەختی سینەی خاکی پاکی نیشتمان
خوا پەرستی کەی، نییە فەڕی لە بۆ دین و ئیمان

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٦٥
(١) چاپی (م. ع): مووجەبی
(٢) لە چاپی (م. ع)دا، ئەم کۆپلەیە سێیەم کۆپلەیە و سێیەمی ئێرەش دووەمی ئەوێیە.



حیکمەتی سەجدەی ئەتۆ خۆشویستنی جێتە بزان[3]
ڕەهبەری[4] کوردم ئەکەم بۆت حیکمەتی دینت بەیان

***

گەش بە ئەی جێی شاهی میدیا، شاد و خوڕەم بەو بژی
جەرگی لاوانی گەلی کوردە لە میللییەت تەژی
شەربەتی وریایی وو ژیریی گەل و کۆمەڵ چەژی
باوەڕت بێ تا جیهان مابێ نەوەی کرمانج ئەژی

***

سەوز و ئاودار و گوڵستان و چەم و باغی وەتەن
حەقمە بۆ موڵکێکی وا حازر[5] لە سەرمایە کەفەن
وا لە داخی کون کونە جەرگی (ئەسیری) وەک سەرەن
هەر دەڵێ قوربانتم، داکم وەتەن، بابم وەتەن

***

(٣) لە چاپی (م. ع)دا: حیکمەتی سوجدە عەزیزم حوببی جێگاتە بزان
(٤) لە چاپی (م. ع)دا: مورشیدی
(٥) چاپی (م. ع): حافز

## حیکمەتی خوایە

حیکمەتی خوایە هەنێ کەس تووشی دەردی میللەتە
ئاخری لەو ڕێیە بەشیان ئاخ و داخ و حەسرەتە
دەربەدەر بوون و پەرێشانی و وێڵی[١] سەر کزی
چوونە بەندیخانەوە، مردن بەسی پاو و پەتە
گەرچی ئەو جۆرە کەسانە بۆ خۆیان ناکەن ئۆخەی
بۆ بڵندیی ژووری گەلیان، پێوەبوونیان ڕەحمەتە
وا نەبێ وا نابێ دونیا تاکو ئەمڕۆ وا بووە
پیاوی مێشک ڕوون و زانا، هەر لە ڕەنج و ئەزیەتە
مەردی مەیدانی سیاسەت مردنی نایێتە بیر
نێرەشەک بۆ کوشتە، مێ تا دەمرێ بۆ خۆی ڕاحەتە
گەرچی زوو دەمرن نیشانگای غەم و دەرد و بەڵان
ناویان تا حەشر ئەمێنێ جێو و ڕێیان جەننەتە
پاشی چەن پشتێ نەوەی پاوانی گەل لێیان ئەگەن
ماچی کێلی گۆڕییان ئەوسا بەنۆرە و نەوبەتە
هەیکەلیشیان بۆ دەکەن، پۆل پۆل دەچن بۆ دیدەنی
لاپەڕەی تاریک بەنیشانەی ئەمانە حەسرەتە
ئەو گەلانەی ژوور و گەورەن کوشتەیان زۆر زوو
ڕۆڵەیان ئێستاکە بۆیە غەرقی ناز و نیعمەتە
پیاوی کردەی گەل بەپەنجە دائیمەن دیاری ئەکەن
ڕاست نییە ئەو گفتە مەشهوورە سیاسەت سیاسەتە

(١) لە دەستنووس – گیو: یۆڵی



زیندەوەر کۆتایی هەر دێ، ساکە وایە مردنێ
بۆ گەل و نیشتمانی چا بێ، ئەو نەمانە عیززەتە
کۆنە پیاوانمان نەزان بوون، بۆ خۆیان ئاسوودە بوون
وا ئەوەی دوای ئێمە دێ، ئاسوودە وو بێ میحنەتە
چارەچیی ئەم بارە کەوتە سەر پیاوی حازری
چارەنووسمان وا بووە، بۆ ئێمە بێ ئەم پەت پەتە
ڕاستە ئەم گوفتەت (ئەسیری) خستتە هەڵبەستەوە
حیکمەتی خوایە هەنێ کەس تووشی دەردی میللەتە

***

## هەتا هەتە(*)

ماڵت بدە لە ڕێگەی میللەتت[1] هەتا هەتە

فەرموودەیی خودایە لە دنیا سەرانەتە

تەنگاو و بێ مەفەڕ و پەت پەتی کرێی

ئەوجا بلند ئەبی ڕێی باوە کاوەتە

هەر گاه دەرت بکەن لە زەوی و نیشتمانی خۆت

هیچ ئای و وەی نەکەی ئەوە بۆ تۆ سیاحەتە

کۆت بەندبی لە کونجی بەنیخانە لێ کەوی[2]

هیچ[3] کۆڵ نەدەی ئەوە حەققی ڕیاسەتە

ماڵ و کەست لە دەس چێ، وەڕس بی لە غوربەتا

بۆ گەورەییت و بڵندیت عەلامەتە

هەڵواسریی لە سێدارە بۆ گەلت

وترانی ناوێ فەڕت تا قیامەتە

لەت لەت کرێی (ئەسیری) لە ڕێی نیشتمان و گەل

جێگەت بەهەشتە، مزی تۆ سەعادەتە

***

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە، بەناونیشانی (ڕۆڵە کۆشش کە...) و لە پەراوێزدا نووسراوە "لە دەستنووسێکی ئەسیری خۆیەوە وەرگیراوە، لەسەر دەستنووسەکە بەرواری (یەکشەم ٢٤ی ڕەبیعی ئەووەلی ساڵی ١٣٤٠ک نووسراوە.

(١) چاپی (م. ع): میللەت.

(٢) چاپی (م. ع): کۆت و بەندیی لە کونجی بەندیخانە لێکەوی.

(٣) چاپی (م. ع): قەت.



## گەڕۆکت بۆ نییە؟

گەڕۆکت بۆ نییە؟ کانی خەڵووز و ئاسن لەژێر پێتە(*)

دەسی بۆ تێوەنادەی؟ ڕۆڵە ئەم کانە لە بۆ کێتە؟

فڕۆکەت بۆ نییە[1] لام وایە ئومێدت نییە بتبێ

ئەوا ئاوریشم و لۆکە، ئەوا نەوت، ئاسنە، وێتە[2]

لەسەر ڕووبار و شیو و ڕۆخی هەڵدێرت نییە پردێ

ئەوا قسڵ و گەچ و دارە، ئەوا بەردە لەسەر ڕێتە[3]

نییە جێگەی هەتیوانت، نییە جێگەی شەل و کەفتەت

بەملیۆن خەرج ئەبێ[4] ماڵت لە خێر و بێری بێ جێتە

قوتابخانانی ساوانت دەبیرستانی لاوانت

ئەوەی هاوردە بەر، کۆڵە، وەیا بێ دینە، یا شێتە

کەلاوە هەڵدڕی دایم، بەئومێدی خەزینە و زێڕ

وڵاتت زێڕە نازانی، لەگەڵ خۆڵایە ئامێتە[5]

کوڕە چاوت کەوە بۆ کاری خۆت، هەر چی بکەی چاکە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٧٥ - ٧٧ کە لە زاری کرمانجی-ی ژمارە(١٠)ی ساڵی دووەم-ڕۆژی٣/٧/١٩٢٧ەوە وەریانگرتووە.

(١) چاپی (م. ع): لەجیاتی بۆ نییە، (هەر نەبوو)ە.

(٢) لە چاپی (م. ع)دا بەمجۆرەیە:

ئەوە ئاوریشم و لۆکە، ئەوە نەوت، ئاسن و پێتە

(٣) ئەم دێڕە شیعرە لە چاپی (م. ع)دا نییە.

(٤) لە چاپی (م. ع)دا: سەرف ئەبێ.

(٥) لە چاپی (م. ع)دا: ئاوێتە.

ئەوەی وا پاشتی خستووە، برا سستیتە، شەرمیتە(٦)
دراو و ئامەدت کانە لە شاخ و دەشت و شیوانە
ئومێدت مێگەل و باغە، خرید و کێڵگەیی دێتە
وتەی چاک(٧) ناگرێ کەڵکی (ئەسیری) بەس مەڵێ حەرفێ
وەهای کەر(٨) کردوون دوژمن، زیاتر کەی دەڵێن شێتە

***

(٦) لە چاپی (م. ع)دا، لەجیاتی: برا سستیتە، شەرمیتە...
لەبەر ڕاستیت و شەرمیتە
(٧) لە چاپی (م. ع)دا: نەسیحەت.
(٨) لە چاپی (م. ع)دا: کرِ.



## کفنت لە بەرکەی چاترە

رۆڵە بمری لەم ژیانەی ئێستە تیا هەی چاترە(*)
سەیری سەرگەردانیی گەل کەی، خۆت فیداکەی چاترە
وا لەسەر پشت بێهەناو و سست و تەمبەڵ لێیکەوی(١)
دەست و پێ هەڵکەی بجوولێیی بۆ هیواکەت(٢) چاترە
نیشتمانت وا وێران بێ، تۆ لە کەیف و نۆشبی(٣)
تووشی دەردی بێ دەوابی ئای و وەی کەی چاترە
گوێت لە دەنگی زرمەیی تۆپ و تفەنگ و بۆمبە بێ
وا لە نەشئەی دەنگی ساز و، نەغمەیی نەی چاترە
دەربەدەربی، سەر کز و داماو بۆ ڕزگارییی گەل
وا لەوەی زیو و زەڕت بێ، لێرە لێخەی(٤) چاترە
سەربەخۆ بی وو، لە پێش چاوتبێ بەدحاڵیی گەلت
بچییە بەندیخانەوە، گیانت لەوێ دەی چاترە
سەرفرۆی بێگانە بی، شایی و وەویت بێ، مەست بی(٥)
وا لە سێپایەت کریێی کفنت لەبەر کەی چاترە
ئەی (ئەسیری)چاک ئەڵێی، کەس گوێ نەدا کەڵکی چییە
سا کە وایە ڕۆژێ زووتر، خۆت بخنکێیی چاترە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا بڵاوکراوەتەوە - ب/٢ - ل/٣٥ - ٣٦
(١) لە چاپی (م. ع)دا: وا لەسەر پشت بی، هەناو سست و تەمبەڵ لێی کەوی
(٢) لە دەستنووسدا (بۆ هیوا گەی)، ئێمە لەسەر چاپی (م. ع) ڕاستمان کردەوە.
(٣) لە چاپی (م. ع)دا: نیشتمانت وا وێرانە بێ، تۆ لە کەیف و خۆشی بی.
(٤) چاپی (م. ع): بیخەی.
(٥) چاپی (م. ع): وەویت پێ....

## مەکتەب و قوتابخانە

ڕۆڵەیی ساوەت[١] لە بۆ مەکتەب بەرە[*]
کوردە ئەو جێگایە ئەمڕۆ جێی فەڕە[٢]
خوێندەواری[٣] پێگەیشتووی مەکتەبە
بۆ هیوایی گەل بەکار و ڕەهبەرە[٤]
ئەو کەسەی مەژگی لەوێ ڕۆشن بووە
ڕوو لە هەرچی (دەوڵەتێ) کا سەروەرە
سەیری نووسراوی علمیانم[٥] کە کرد
چشتێکی وام تیا نەدی بێژم شەڕە[٦]
تووشی هەندێکی دەبی[٧]، گەوج و نەزان
مەژگی تاریکە، ئەوە ئەسڵی کەرە[٨]
هەندێ باوەڕیان نییە گومڕابوون[٩]
باعیسی مامەوسایی[١٠] بەدفەڕە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا بڵاوکراوەتەوە – ب/١ – ل/١٠٣ – ١٠٤

(١) لە چاپی (م. ع)یدا: ساوات.

(٢) لە چاپی (م. ع)یدا: کوردە ئەو جێگەیە ئەمڕۆ فەڕە.

(٣) چاپی (م. ع): خوێندەوارانی.

(٤) چاپی (م. ع): بۆ هیوای گەل، ئەو بەکار و ڕەهبەرە.

(٥) چاپی (م. ع): عیلمانم.

(٦) چاپی (م. ع): هیچی وام تیادا نەدی بێژم شەڕە.

(٧) چاپی (م. ع): تووشی هێندێ کەس ئەبی...

(٨) چاپی (م. ع): مەژگی ئاوە ئەسڵی کەرە

(٩) چاپی (م. ع): هێندێ باوەڕیان نییە گومڕا دەبن.

(١٠) چاپی (م. ع): مامۆستایانی.



ئەو کەسەی وریاوو زانا بێ بەفەن
بۆ نەجاتی کەشتیی گەل لەنگەرە
خوێندنی دینیش بزانێ چاک ئەبێ
هەردووکی بۆ دین و دنیا ڕەهبەرە
مەدرەسە زۆر چاکە فەننی تیا هەبێ
پێگەیشتوویی[١١] ئەوێ جێی سەرسەرە
خوێندنی تیایا[١٢] نییە وێران بووە
خۆ خەریک کردن لەوێدا بێ بەرە
کوردە گوفتاری (ئەسیری) بێنە کار[١٣]
ڕۆڵەیی ساوەت[١٤] لە بۆ مەکتەب بەرە

***

(١١) چاپی (م. ع): پێگەیشتوانی.

(١٢) چاپی (م. ع): تیادا.

(١٣) چاپی (م. ع): بێنەجێ.

(١٤) چاپی (م. ع): ساوات

## چاخی سەحەرە

مەلێ ئەم ڕێگەیەی گرتوومە ئەترسم خەتەرە
ڕۆڵە ئەو چشتە، کە تووشی ئەبی ئەمجا زەفەرە
ئەو نەمامەی، کە فیدایی وەتەنی چاندوویە
بەهەموو لایێ ڕەگی ڕۆییوە، لقشی لە بەرە
مەلی هەر چەن وەتەنی کوردی شیمالی هەیە، وا
هیجرەتی کردووە، هەندێکی لە جێ دەربەدەرە
هەندێکیشیان دەگرن دەیبەنە قەسابخانە
وەکو مەڕ سەر دەبڕێن، خوێنی ئەمانەش هەدەرە
هەرچی غیرەتکەش و مەردە شوعەراو و ئودەبا
مات و حەیرانە دڵی پڕ غەم و دەرد و کەدەرە
هەرچی قەومی موتەرەققی هەیە ئەمڕۆ لە جیهان
هەر کە هێزی بووە، هەڵسێ بووە بۆی ئەم قەدەرە
گەورە کوژران و، دێ سووتان و، لەجێ دەربەدەری
پاشی ئەمە نیزیکە ئینجا لە بۆ میللەت سەمەرە
چونکە بێگانە بوو، چیی کرد بەتۆ دوژمنەکەت
ئەوەی گرتی هەڵیواسی، ئەوەی ما دەربەدەر
مەکە باوەڕ بەوتەی خۆش و تەڕی بێگانە
شەهد و شەککەر بێ، دەهەندەی بەتۆ ئیللا بەزەڕە
هاوزبانی وەتەنی، دوژمنتش بێ ڕۆڵە
باوەڕی پێ بکە، هەم دەردتە، زەهری شەکەرە
بەسە ئەم بیر و خەیاڵاتە ئەسیری تا کەی
تێپەڕی شەو بەتەواوی، ئەوە چاخی سەحەرە



## فێری عیلم بە

کوردە چ فایدەی هەیە ئەم خەنجەرە[*]
ئەم فیشەگە[1] و ئەسلیحە وو وەروەرە
بار[2] مەکە ئاسن و باروت لە خۆت
باری گران لایەقی گاو و کەرە
بەس بخۆ نانی جۆ، لەپێکە کەڵاش
سواری کەر و حەچە بڕۆ و وا وەرە
ڕووت و ڕەزیل بی بەمە خوا ئەمری کرد
بەسیەتی ئەم گەوجییە زوو هەڵگرە
عیلم و مەعاریف ئەوەتا بەش دەکەن
هەڵسە وەرە مووچەیی[3] خۆت وەرگرە
سواری سیلاحی خۆ دەبن، ئاری پا[4] سەیری
فرۆکیان بکە، حیرەت گەرە[5]
گەر نەفرۆشێ بەتۆماڵ، ئەجنەبی
ڕووت دەمێنی، لە وتەم[6] گوێ گرە

(*) لە چاپی (م. ع)یشدا بڵاوکراوەتەوە. ب/١ - ل/١٠٥ - ١٠٦
(١) چاپی (م. ع): فیشەک.
(٢) چاپی (م. ع): باری مەکە.
(٣) چاپی (م. ع): حیسسەیی.
(٤) ئەوروپا.
(٥) چاپی (م. ع): سەیری تەیارە بکە عیبرەت گرە.
(٦) چاپی (م. ع): لە قسەم.

مـــــــيللەتێ نـەتـوانـێ بـكـا دەرزيـيـێ
كـــارى پەرێشـــانيـــيـــە ئەو بێ فـــەڕە
فـــێـــرى عـــيـلـم بە لە هەچى جێ ببێ
گـەرچى لە چين، گـوفـتـەيى پێـغـەمـبـەرە
كـاكـە فـەقێ مـەدرەسـە، يا مـەكـتـەبێ
زوو پـەلەكـــــە، ڕێگە بەهـيــــوا بـەرە[(٧)]
چونكە نەوەى كـوردى[(٨)]، حـەقـقت پێ دەڵێم
دەرسى علوومى حـيكەمـيـيش[(٩)] وەرگـرە
فـــرســـەتە ئەم چاخى[(١٠)] جـــوانيـــيـــە برا
مـەسـخـەرە وو كـەيف و سـەفـا[(١١)] هەڵگرە
كـــوردە (ئەسـيـرى) وتەيى[(١٢)] حـەق دەڵێ
تەربيـــەيێ حـــيكمـــەتى لێ وەرگـــرە

(٧) چاپى (م. ع):

كـاكە فـەقێ تۆ بچـۆرە مـەكـتـەبێ
سەعى بكە ڕێگە بەمـەقسـەد بەرە

(٨) چاپى (م. ع): موسڵمانى.
(٩) چاپى (م. ع) لەجياتى (حيكەمييش): ئەجانب.
(١٠) چاپى (م. ع): وەقتى.
(١١) چاپى (م. ع): خورافات.
(١٢) چاپى (م. ع): قسەيى.



## مەرسييە (لاواندن)[(*)]

مـردن ئێـسـتـاكـە لەكـوێى دەيسـاوەرە
گـيـان ئەگـەر پێـويسـتـتـە زوو بى بەرە
شـێـتـيـيـە بۆ كـەس لەتۆ ترسى هەبێ
تۆ هەر كـــارت بـەجێ بێنى گـــەرە
نەك گەدا، نەك شاه و، نەك پير و جوان
زيندەوەر گـشـتى لە دەس تۆ بێ سـەرە
زيندەگـانى نرخى لاى عـاقڵ نيـيـە
ئەم خـەو و خـوليـايە هيـچـە و بێ فـەڕە
ئەو دڵەى گـەشبێ بەديدارى جـيـهـان
ئـاگـــرى ديدارى دەيـكـاتـە گـــڕە
شێخ مـحـەممەد عـەلى دوێنێ بارى كـرد
بێ هەوەس بوو لـەم خـــەراباتە شـــڕە
گشت حيـسـابى مـەنزڵى بوو جێ بەجێ
خـەيمەگـاهى وا لە لێـوى كـەوسـەرە
دەرچوو بۆ تەئريخى (الله غـــفـــور)[(**)]
هەر كـە بۆى لادا (ئەسـيـرى) دووپەڕە

***

(*) بۆ شێخ محەمەد عەلى كەڕەى تاڵەبانى (خواليێى خۆشبێ).
(**) دەستەواژەى (الله غفور) بەژمارەى ئەبجەدى ساڵى كۆچى شێخى ناوبراوە، كە دەكاتە (١٣٥٢ى. ه) و (١٩٣٣/١٩٣٤ى. ز) (ت).

## نه کوردستان وەکو جارانه نه من

کەژی کوردستان پڕ پڕ لە فەرە
وەتەن بانگت دەکا[1] هەستە دەهەڕا
لە دووری جیایی ڕووی بەفەڕت
لە ژانا بەندی سی وو[2] جەرگ جەڕا
نە کوردستان وەکو جارانە نە من
گەل و نیشتمان و کردە گشتی گۆڕا
گوڵی باغ و نیگاری خۆشەویستی
لە چیمەندا لەیەک نیشتوونە شەڕا
گوڵی کوڵمی شرینی نەوجوانی
پەڕەی لالە لە عەکسی بەرقی دڕا
لە دەنگی بولبول و قومری و کەو و پۆڕ
مرۆی مەریخ و ژاپە گێژ و کەڕا
مەلا باسی بەهەشتت بۆ دەخوێنی
وەرە من پێت نیشاندەم بێیە سەر ڕا
چیاش گونبەدی مزگەوتی دنیا
لە بانی بانگی کوردی زوو بوو دڕا[3]

(*) ئەم شیعرە لە دیوانی چاپی (مستەفا عەسکەری)شدا هەیە. ب/٢ - ل/٣٨ - ٣٩.

(١) لە چاپی (م. ع)دا: بانگ ئەکا.

(٢) لە چاپی (م. ع)دا: سیی و.

(٣) لە چاپی (م. ع)دا: پیتی (ڕێ)ی (بانگ درا) بەڕێی قەڵەو دانراوە، لەبەر سەروا (قافیە) ئێمە هەر بەناسکیمان دانا.



بەبێ ئەندازەیی نەوت و زەڕو زیو
لەخۆرئاوا بەیێکجا[4] دەنگی زڕا
لە دووریی ڕوویی توو و دەردی نیشتمانی
پەرێشانە (ئەسیری) بێ دەهەڕا

(٤) لە دەستنووسدا (یکخا)....

## هۆگری

هۆگری و یەک دەسی بۆ بڵندی بەسە[*]
باعیسی[١] یەکدی گریی خزم و کەسە
گەل هەموو هەرکە بوونە یەکماڵی
دام[٢] و تەزویری دوژمنان عەبەسە
سوودی خۆبی لە خەو هەڵستانە
بۆ دوارۆژ کۆششە[٣] و هەوەسە
گەورە وو گچکە هەرکە بوونە برا
بۆنی هیوای دڵ بەیەک نەفەسە
کاری گەل هەرکە توند و تینی بوو
قیرەیی بەدگۆ، ویزەیی[٤] مەگەسە
بۆ وێرانکردنی بینای بەدخواه
هۆگریی کورد و یەک دەسی، هەرەسە
هەر گەلێ پیاوی یەکتری ناسی
ئەوە[٥] بۆ دڵخوازی دەست ڕەسە
گەل کە خۆی ژیر و گورج و وریا بێ
پیاوی بەدبین و دڵ چەپەڵ چ کەسە؟

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٥٣
(١) چاپی (م. ع): ئەسەلی
(٢) چاپی (م. ع): دامی
(٣) چاپی (م. ع): کۆشش و...
(٤) چاپی (م. ع): گیزەیی
(٥) چاپی (م. ع): ئەو



هۆ (ئەسیری) بەسە نوویسینی (بێژ)[٦]
هۆگری و یەک دەسی بۆ بڵندی بەسە

***

(٦) لە دەستنووسی لای (گیو)دا پێشتر نووسراوە (ئەی) دواتر کراوە بە(هۆ...)
- لە چاپی (م. ع)دا (بیر)...

## مەعرووف جیاووک

کوردی گوردی ئەگەر[1] دڵت پاکە
پێت بڵێم ڕێگەیی ڕاستی و چاکە
پێت نیشاندەم لە کوردەکان گەورا
سەروەری ڕاست و پاک و بێباکە
ناوی مەعرووفە، ناوبانگی جیاووک
بدە سینە لە ڕووی زەوی تاکە
کارگێڕان و کردە وو زانین
گردە لەو، بێجگە بیری هیوا کە
سوقرات و ئەرەستۆ و ئەفلاتوون[2]
وا دەبوون گەر بوایەن ئێستاکە
نەردی فەڕین و بەخت و هاتت ئەوێ
پێی بگە دەستی بگرە خێراکە
هەلە نووسین و دۆستی و دینی
چاکە تاڵانە لای، دە هەڕاکە
پیاوی وا ژووری بێ (ئەسیری) گەلت
بەرزە بەختت ئەژی دەبڕواکە

***

(١) لە دەستنووسدا (ئەگە).

(٢) سێ فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی کۆنن.



## برا و کاکە

میللەتم گەورە وو کۆن و پاکە
نییەتی کردەیێ جگە چاکە
لە تێبینین و بیر و هۆشی سەر
لە جیهاندا لە ڕووی زەوی تاکە
خۆشەویستی لە کەللەی لاوی
یادی یەزدان و میللەت و خاکە
لاوی گەورە و بچووکی دەستە برا
بانگی یەکتر دەکەن برا و کاکە
ڕوو بەرەو ژوورە کاری فڕینی
دەس بەهیوا گەیشتنی هاکە
هیچ نییە حیزە فێڵی بەدخواهی
گوڕڕەیی وشەو و فیک و فاکە
گیانی شیرینی خۆت بکە پێشکەش
لاوی من چیت هەیە بۆ گەلت داکە
کەسێ چاکەی نەبێ بۆ خزم و گەلی
لەشی خۆراکە بۆ سەگان، لاکە
گەر نەجووڵێی (ئەسیری) بۆ گەلی کورد
ڕۆژێ زووتر لە ناوبچی چاکە

***

## مەلیک غازی

بەختت درەوشا وەکو ڕۆژ بوو بەعەیان سەوداکە
بەنەوازش لە بەڵات حاصڵی بوو هیواکە
چوومە خزمەت مەلیکی تەبع بڵند وەک پایەی
گەر لە ئەخلاقی بپرسن، نەبوو بێجگە چاکە
ئەمەی ئەم شارە، کە شادە بەقوودوومی تاکە
نەسەبی دیارە وەکو ڕۆژە لە نوتفەیی پاکە
بەستایش بەسوپاسی لایقە دیوان بنووسم
بۆ ئەو ئەعلا نەسەبەی فیکر و ڕەئی ڕووناکە
هەر کە دانیشتە حوکم تاڵعی میللەت گیرسا
ئەلوەداعێ لە پەرێشانی ئەکا گەل هاکە
هەرە دیاریتری ئەولادی کەسێکی وایە
خوا کە فەرموویەتی دەرحەقی ئەوی لەولاکە
خۆشەویستی سەبەبی ڕەحمەتی یەزدانە کەسێ
بوغزیکا ، خوا غەزەبی لێدەگرێ بڕواکە
هەر چەنێ کردە وو ئەخلاقی جوانی بێژن
باوەڕی پێ بکە ڕاستە لە جەوابی ئاکە
دەوری کۆن بێنە خەیاڵ، حاڵی چلۆن بوو میللەت
سەیری ئاسایشی ئەمڕۆ بکە زۆر باڵاکە
خۆشەویستیی مەلیکی موشەفیق بێ هەرکە گەلێ
ترسی دەورودەری نابێ هەموو کاری چاکە
هەر کە مەڕ لالەوەڕێکا ، لە شوانی گومبێ
بێ شکە ئەو مەڕە بۆ گورگ و چەقەڵ خۆراکە



کە ڕەعییە بووە لەشکر لە حەوالیی سەردار
بەهەموو جۆرێ لە چاودێریی قسووری ناکە
ساڵەوەختێ لەمەوبەر ئاگرەکەی ئاسووری
کە گڕا، چۆنی کوژان ئەم مەلیکی بێ باکە
وردی دوارۆژەوە بە، میللەتی کورد تێفکرە
لەچیا چاکە و کەڵکت بێ، مەوەستە واکە
موخڵیسی ڕاستیی مەلیک غازی-یی نەوجاهت بە
لەشکری مونتەزەمی ئەوبە لە ژێر ئاڵاکە
ئاشکرا بێژە (ئەسیری) لە جەلالا دەبژی
بەمەلیک غازی لەناو گشت مەلیکانا تاکە

***

## لەجێ جێ کۆمەڵکە

ئومێدی گەورەیی پێشووت، بزانە بێ کەڵکە[*]
بێگانە هەرچەنێ چابێ براکە، هەر خەڵکە
بۆ خۆت بجووڵێ بەگورجی لە خوێندن و کردەت
کۆشش بکە شەو و ڕۆژ، لاق و دەستەکەت هەڵکە
لاوت بنێرە، حەکیمی لە ئەوروپا فێر بێ[1]
هۆگر بە پیاوی کە، سستییە لەجێ جێ کۆمەڵکە[2]
خزمت بناسە، تازە کە خزمایەتی سەر نەو
پێویستی گەل چبێ بۆ لۆندەرە تل کە
هۆگر ببن هەموو گەل خوێندەوار و زانا بن[3]
ئەوجا مەبەستی میللەتی کورد بێتە جێ بەڵکە[4]
ئەوجا کە دەرکەوێ ئومێدی گەلی بەد خواه
خووی کوردە لە هەرچی هەرایێ بێ سەرپەلکە[5]
بلێ بنووسە بجووڵێ (ئەسیری) لەم ڕۆژە
هیچ کۆڵ نەدەی پەلەکە موشکیلەت حەل کە[6]

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە. ب/١ - ل/٦٤
(١) لە چاپی (م. ع)یدا: وڵات بنێرە حەکیمیی لە ئەوروپا فێر ببێ
(٢) لە چاپی (م. ع)یدا: هۆگری پیاوەکە سستییە لەجێ جێ کۆمەڵکە
(٣) لە چاپی (م. ع)یدا: لەجیاتی (ڕانابن)... (دانابن).
(٤) لە چاپی (م. ع)یدا: ئەو خاکە مەخسەدی میللەت بهێتە جێ بەڵکە.
(٥) لە دەستنووسی لای گیودا پێشتر بەم جۆرەیە دواتر دەستکاری کراوە و بووەتە:
(خۆ خواهی کوردە لە هەر جێ... تاد) لە چاپی (م. ع)دا: خۆی گەرچییە؟ لە هەر چ بێ هەر ئایینێ سەرپەلکە.
(٦) لە چاپی (م. ع)دا: لەجیاتی (پەلەکە)... (چەلەکە).



## وەسیەت

وەسییەت بێ ئەگەر مردم وەرە سەر گۆڕەکەم[1] قالە[*]
بڵێ ئاواتەکەت پێکهات هەڵستە بێرەدەر خاڵە
کە بوویتە (سەرجەلەو) (سەرپۆلی) گەورەی لەشکری کوردان[2]
لەبەر هیچ ئەزیەت و جەورێ، نەکەی ئۆف و نەکەی ناڵە
بەخۆت و لەشکر و پۆلت لەسەر گۆڕم مەشق دادەن[3]
ئومێدم وایە زندووبم لەبەر شادی بەئەو حاڵە[4]
وەکو خاڵت بە، ئەی ڕۆڵە، خەریکی کاری میللەت بە
ئەوەی خەرجی ئەکا خاڵت لەڕێی خزمەت سەر و ماڵە[5]
برازێوە بەزانین و بەچاکە و دین و چاوتێری[6]
لە ئازایی وەهابە، پێت بڵێن وەک ڕۆستەمی زاڵە
بەفەرڕە ئەو کەسەی وا سەنگەری تیر و غەم و دەردە[7]
لە ڕێگەی میللەتی کوژرا، لەژێر خاکا کفن ئاڵە
عەزیزە ئەو کەسەی کۆشش بکا بۆ هاوزوبانی خۆی
ئەگەرچی ژینی تاڵە، عاجزە بەدبەختە کەم حاڵە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە. ب/١ - ل/٤٣ - ٤٤
(١) چاپی (م. ع): قەبرەکەم.
(٢) چاپی (م. ع): کە بوویتە زابتی قیتعە و بلۆکی عەسکەری کوردی
(٣) چاپی (م. ع): بەخۆت و عەسکەر و قیتعەت لەسەر قەبرم بکەن تەعلیم
(٤) چاپی (م. ع): لەجیاتی (زیندوو بم) نووسراوە (ئیحیا بم)
(٥) چاپی (م. ع): ئەوەی سەرفی ئەکا خاڵت لە ڕێی قەومت سەروماڵە
(٦) چاپی (م. ع): موجەهەز بە بەعیلم و حوسنی ئەخلاق و سەخا و دین
(٧) چاپی (م. ع): شەریفە ئەو کەسەی مەعرووزی بارانی غەم و دەردە.

شەهیدی میللەتم تەسلیمی خاکم کەن گەلی کوردی
بپۆشن خاکی سەر گۆڕم، بەڕەیحان و گوڵ و لالە
لە ڕێگەی میللەتت هەر چیت بەسەر بێ خۆشە ئەی ڕۆڵە
لە ژووری لاپەڕەی تەئریخ ئەنووسرێ سوورەتت قالە
موکافاتی (ئەسیری) ڕۆژی مەحشەر بادەیی کەوسەر
ئە لەم دنیایی دوونە، بێ بەشە، دایم دەمی تاڵە

***



## ماتەمنامە

ئەم بیست و پێنجی ئەیارە کوردە ماتەمە[*]
ڕۆژی موسیبەت و بەڵا و پەرێشانی و غەمە
لەم ڕۆژە شێخی پاڵۆ و نەهری[1] شەهید کران
لەو کاری تورکە[2] مرۆ ئەمڕۆ سەرسەمە
دوو وەقعە جەرگی هەموو موئمینی سووتان
یەک وەقعەیی (حوسێن)ی شەهیدە... دووەم ئەمە
دوقتۆر فوئاد و خالید و یووسف زیاء و شەریف
کوژرانیان هەلاکی[3] نەوەی گەورەی ئادەمە
ئەو سەروەرانە کە نووسیم لە هەڵبەستی[4] شوهەدا
کوردستان لە ماتەمیان دووکەڵە و تەمە
خوێنە دڵی کەسی نیشتمانی و گەلی
جەرگی کەبابە لە فرمێسکی، جێگەشی نەمە
یاران وەرن توخودا کۆتەڵێ بکەین
لەو کۆتەڵی شوهەدا خۆکوژین کەمە
یاران وەرن با بچینە پرسەیی کوردی سەروو
ڕەنگین بین ئێمەش ئەلەو شینە بەو خومە
تا ڕۆژی دوا ژیانم (ئەسیری) دەڵێ
هەڵبەستی ماتەمی شوهەدا بێژی شەرتمە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٧١ - ٧٢
(١) چاپی (م. ع): نەهرو پالو...
(٢) لەدەستنووسدا پێشتر وەکو چاپی(م. ع)نووسراوە: (تورکە...)دواتر کراوەتە (کردە).
(٣) چاپی (م. ع): هیلاکی...
(٤) چاپی (م. ع): کۆمەڵی

## شیری بڕندە قەڵەمە

لە غەمت ڕۆڵە ئەوا ناخۆشیی بچکەم وەرەمە
جگەرم خوێنە، دڵم خانەیی دەرد و ئەلەمە
بۆتە خولیا لە سەرم، گەر لە سەرم دەن بەکوتەک
بیری تۆ هەر لەسەرە، چارەیی دەردت لە دەمە
لە چ دەورێکە بزانە بەشەری ڕوویی زەمین
تا بەکەی هەر لەسەرت بێ پەت و نێڵە و کەڵەمە
ئەوە وا ڕەهبەرتە دوژمنی میللەتتە
باوەڕت وایە کە قوتبە، لە حەقیقەت سەنەمە
هەرچی زانایێ کە باوەڕکەرە بەو جۆرە کەسە
ئەوە کابووسی موسڵمانە، بەڕاستی شەوەمە
گەرچی بەدبینەکەت ئیسلامە لە چاوی خواری
ئەوە وتەی چاکە کە دەیڵێ بەتۆ لەفزی عەجەمە
کەسی من پارە پەیاکە ببە خاوەن زەڕ و زیو
ئەوی ئەمڕۆکە بەکارت بێ، بەڕاستی درەمە
چارەیی دەردی تۆ عیلمە، دەبکۆشە شەو و ڕۆژ
لەم زەمانە بەخوا شیری بڕندە قەڵەمە
خۆشەویستی وەتەنی دوێنێ پەیامی هێنا
بۆ سەنایع ئەوە بۆ لەندەن ئەچێ کاکە حەمە
بەمە کەیف خۆش و گەش و شاد و ئومێدم چا بوو
بۆ بلندیی گەلی کوردی، ئەمە ئەووەڵ قەدەمە
پێک دی هیواکەت ئەسیری، دەمێ ئارامت بێ
لە خوا مەبڕە ئومێدت، ئەوە خاوەن کەرەمە

***



## سوودی زوان

مانی میللەت بەپارێزی زوانە[*]
شایەدی ئەم وتە، ژینی کوردانە[۱]
زوانە نامووس و پیاوەتیی میللەت
زیندەوەکردنی ناوی کۆنانە
بۆیە ئەمڕۆ لە هەموو کۆمەڵی کورد
باسی زۆر و دەستی (نەمەردانە)[۲]
ئەوە ئەمڕۆ لە تەئریخی تازە
نووسین دەوڵەتی کۆنی (کۆسانە)
گفتوگۆ کردنی خۆشی لاوان
لە سنوور و وڵاتی (میدیانە)
لە قوتابخانە خوێندنی ساوان
بەزەیی و داد و عیلمی (ساسانە)[۳]
هێزی سەربازیی ئەردەلان ئەنووسن
شیعریان ڕۆژهەڵاتی (بابانە)
تۆپە گەورانی کۆنی قەڵات
چاپی دەگرن لە مولکی (سۆرانە)

---

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/١ - ل/٥٤
(١) چاپی (م. ع): شایەتی ئەم وتانە مانی کوردانە
(٢) چاپی (م. ع): باسی زۆر و دەس بەمەردانە
(٣) چاپی (م. ع): ئەم نیوە دێڕە و نیوە دێڕی دوای ئەم نییە و خاڵی لە جێدا دانراوە.

گەرچی ئەم دەوڵەتانە هیچی نەمان
ناویان تا ئەبەد لە ناوانە
زندووە نامرێ (ئەسیری)میللەتی تۆ[٤]
چون زوانی پاراستووە لە بێگانە

***

(٤) چاپی (م. ع): میللەتەکەت.



## یانە

خانەگاهی مونەووەرە، یانە
یانە پێویستی ژینی لاوانە
ئەو سەرۆکەی کە ژووری هەمووانە
کەللەیی پڕ لە هۆش و فەن و زانە
ئەو کەسانەی کەوا لەوێ پایەن
دەس بژێری بڵندی کوردانە
کۆڵەگە و هێزی بەردی بنچینەی
ناوی مەعرووفە مەردی مەیدانە
ناوی فەرینی یانە دەنگی دا
هەر لە فەرغانەوە تا وەکو غانە
یانە پێویستی ژینی لاوانە
ناژیێ بەچکە مەل بەبێ لانە
ئامەد و فەڕوو کار و فەن زانین
وا لەوێیە، بیدینە، بیزانە
چیت هەیە بیدەرێ ئەگەر کوردی
هەر لە ملیۆنێ تاکو یەک ئانە
بۆ ئەمەی هاتە دی ئەسەل جیاووک
ڕۆشنی دیدە وو هێزی جانانە
نووحی کوردی بژی بەبێ خانوو
زوو پەنادە (ئەسیری) بۆ یانە

***

## هۆ جگەر خوێن(*)

فەنن و زانینت ئەسەل بەرزبوونەوە و سەرکەوتنە(**)
گەل کە نادان بوو بەشی دیلی و وێڵی(١) و مردنە
ڕێگەیی ڕاهی(٢) قوتابخانە و دەبیرستانی گەل
ڕێگەیی ڕزگارییە(٣) و، ڕێگا بەهیوا بردنە
چارەیی زانین و زانستی، کە پێک بێ زوو بەزوو
هۆ جگەر برژاو(٤) کولێنی گەل لەزەڕ پڕکردنە
زەڕ بەکۆشش دێتە دەس، گورجی و دەسوبردی دەوێ
هەر کەسێ کاری چ بێ، لەو کارە چاتر کردنە
بۆ تەوانا تێ کۆشێ گشت و خرید و کارگەری
گشت لەگەڵ ییێکدی تەبابوونە و فەڕی ییێک ویستنە
بۆ تەبایی هەربلێین ماموستایان دەم بەدەم
کار ئەکا گەوایی ئەمە تەلقینی مردووکردنە(٥)
هۆ ئەسیری گەرچی وەک چیرۆکە هەڵبەستت وەلێ(٦)
بەندی دەستوورە بەکارهێنانی کورد سەرخستنە

(*) ئەم هەڵبەستە بەرانبەر بەهەڵبەستێ نووسیم، کە شاعیری کوردی زازا لە گۆڤاری هاوار بۆمی نووسیبوو، ناوی جگەرخوێنی دانا بوو. (ئەسیری)
(**) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/٢ - ل/٦٥
(١) چاپی (م. ع): پوولی. (٢) چاپی (م. ع): ڕێگەکەی سەمتی.
(٣) چاپی (م. ع): ئازادییە.
(٤) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (برژاو) دواتر کراوەتە (خوێنین).
(٥) ئەم دوو دێڕە شیعرە (واتە چوار نیوە دێڕە) ئەمە و ئەوانەی سەرەوە لە چاپی (م.ع)یدا نییە.
(٦) چاپی (م. ع): دەڵێی.



## چونکە بەدبەختی(*)

چونکە بەدبەختی بەشت ئەم دیوو ئەودیو کردنە
پیاوی بەدخوو دەربەدەر ڕۆژێکی سەدجا مردنە
بۆ دواڕۆژت نەجوولای داکو چشتێکت ببێ
مەکتەب و نامەی شەهادە، ڕۆڵە خۆسەرخستنە
تەمەڵی و کەیف و گەڕان و چایخانان و قومار
خۆ پەرێشانکردن و ڕێگەی تورەقی بەستنە
ئەم پەرێشانییەت کە ئیمڕۆ وا کەشەنگی کردووی
زادەی کاتی جوانیتان نەزانی و نووستنە(١)
بەسیەتی بیرێ بکە، ئەوجا لە حاڵت تێ بگە
دەست و بردێتی بجووڵێ، نۆرەی سەرکەوتنە
چاوێ هەڵبێنە ببینە، هەرچی گیانداری هەیە
دەست و بردی ڕۆژییە، دنیا سەراسەرکردنە
کردنە ئنجا لە پاشا خواردنە، سەرکەوتنە
کۆشش و کردە و بزووتن ڕێ بەهیوابردنە

(*) لە دەسنووسێکی لای خۆمانەوە وەرگیراوە. (م.ع)
(-) ئەم شیعرە لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/١- ل/٥٢
(١) ئەم دێڕە شیعرە لە کتێبەکەی مامۆستایان شارەزا و جەباریدا نەنووسراوەتەوە. (م.ع).

# گەل و نیشتمان

دەور و پشتی خانوو و، جێگەی هەوارم گولشەنە[*]
ئاوی جۆگە و گۆل و ڕووبارم شرینە و ڕەوشەنە
گیای بەهاری مێرگی دامێنی چیا وو کێوی من
نەرگس و لالە و ترنجۆک و بنەوشە و ڕەیحەنە
لێوی جۆگەی خوڕەم و ساق و سیمینی[1] دڵبەرم
ژاڵە وو نەسرین و سونبول، یاسەمین و سەوسەنە
هێندە پێکەوتە گیا و پووشی چیای کوردستان
کاوڕ و بزنم وەکو گامێش و گایی سێ بەنە
سەیری هەرچی شیو و شاخی هەردە وو دەشتم بکەی
باغ و بێستان و ڕەزە، شاراو و کێڵگە و خەرمەنە
دەنگی خوڕەی ئاوی ژێر دارم بەسەر بەرد و پەلا
خۆشترە سەدجا لە دەنگی عوود و ساز و[2] دەندەنە
ئەو بەری بەڕووەی لە کوردستانی من پەیدا دەبێ
چاتر و شیرینترە سەدجا لە پستە و کەستەنە
چاوەکەم ئەو جاجکەی وا تیرەمنتی پێ دەڵێن[3]
ئامەدی کوردوستان، خۆشەی جەوی دارەبەنە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/١ – ل/٣٧ – ٣٩

(١) لە دەستنووسدا پێشتر (ساق) نووسراوە، دواتر کراوەتە (پاک).

(٢) لە دەستنووسدا نووسراوە (... ساز ئەو دەندەنە).

(٣) چاپی (م. ع): ... لێرە منتی پێ دەڵێن.



گەر تۆ بنواڕی لە کوردستان سەراسەر سێ بەشە
باغ[4] و دارستان و کیلگە، ژێر ئەمانەش مەعدەنە
هەر زەمینێکم بدینی بێ درەخت و بێ گیا
کانی زێڕ و زیوە، پێویستت هەیە لێی هەڵکەنە
من چ پێویستم نییە تۆو چەندن و هەوڵی مەزید
داری کێوانم، بەڕوو و بادام و گوێز و قەزوەنە
شانەیی هەنگوینی شاخی، گۆشتی کێوی لێ مەعاف
خۆم چلۆن قوربان نەکەم بۆ ئەم حەشار و مەسکەنە
سەنگەر و چاڵی زەوی، شوورە و قەڵاتم بۆ چییە
من کە دارستان و بێشە و شیو و شاخم مەئمەنە
پشتکۆهـ و ئەڵوەن و شاهۆ و ئەرارات و نەوا
هیچە لای شاخانی من قرپات و ئەلپ و پیرەنە[5]
کەپری تاوستانەیی کوردی لە لێو باغ و چەما
خۆشترە سەد جا لە قەسر و باغی قیوامولسەڵتەنە[6]
زانیار و گورج و ئازایە بڕی پیاوی گەلم
مەردی مەیدانە بڕێکی لێخوڕ و خەنجەر زەنە[7]

(٤) لە دەستنووسدا پێشتر نووسراوە (باغی) دواتر کراوەتە (باغ).

(٥) قرپات (چیای کروات): چیای کرپات–ی نێوانی ڕۆمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا.
ئەڵپ: ناوی چەند چیایەکی ئەورووپایە، گەورەترینیان لە باکووری ئیتاڵیادایە.
پیرەن: یانیش پیرنیێ، چیایەکی نێوانی فەرەنسا و ئیسپانیایە.

(٦) قیوامولسەڵتەنە: پێشتر لە پێش(سلطنە)وە وشەیەک نووسراوە بۆم نەخوێنرایەوە، دواتر کراوەتە (قوام)... زاراوەیەکە، پلە و پایەیەکی بەرزی کۆنی ئێران دەگەیەنێ.
– لە چاپی (م. ع)دا نووسراوە (قەنبەرسەڵتەنە)

(٧) چاپی (م. ع): مەردی مەیدانە... خەنجەر، ڕەنە

لاوی کوردی من نەوەی میدیا وو کەی ئەخساری ئەتوو
خاوەنی سامان و تەخت و زۆر و تاج و عەنعەنە
دەشت و شاخی گۆی زەوی باپیرەکانت گرتبووی
بستە جێگایێ نییە پایان نەنابێ لەو حەنە[٨]
بۆیە ئێستاکەش ئەوانەی پشتی[٩] خۆیان زانیبێ
زۆر بڵندە بیریان، بێ باک و شۆخ و گەورەنە
ئارەزووی زانینی چشت و کارگەری[١٠] گەر فێر ئەبی
مەرکەزی فێربوونی[١١] علمت رۆڵە ئەمڕۆ لەندەنە
چاخی پێغەمبەر لە زانین[١٢]، چین بوو ئوستادی جیهان
لۆندەرە ئەمڕۆکە شاری سەنعەت و عیلم و فەنە
عیلم و عیرفان و بڵندی[١٣]، کەوتە هەرچی جێگەیێ
ڕوو لەوێکە زوو بەزوو فێری بە هەروەک مەنگەنە
تووشی هەرچی زانیاری کورد ببی لێی تێبگەی[١٤]
حیکمەت و زانینی وەک ئەبوکەوسیی دێوەژەنە

(٨) چاپی (م. ع):
دەشت و شاخ گوێ زەوی باپیرەکانت گەر بتەوێ
بەستە، جێگای نییە، پایانە نابێ لە چەنە
(٩) چاپی (م. ع): نەسەبی.
(١٠) چاپی (م. ع): کارگەی.
(١١) چاپی (م. ع): تەحسیل و.
(١٢) چاپی (م. ع): وەختی پێغەمبەر لە عیلما...
(١٣) چاپی (م. ع): سەعادەت.
(١٤) چاپی (م. ع): تووش هەرچی عالمێکی کوردی لێی تێ نەگەی.



توخمی ئاری، واریسی نووحی نەبی، کرمانجی من
مەهجەری کرمانە ئەو جێیەش هەوارگەی جەرمەنە[١٥]
ئەی ئەسیری ڕۆژ و شەو مەدحی گەل[١٦] و خاکت بکەی
هەر بەجێ نایێ دەسا ئەمجارە لێدە[١٧] کەم چەنە

***

(١٥) چاپی (م. ع): تووخمی ئاری و ئارت، نووحی نەبی کرمانجی من
موهاجیری کرمانە، ئەو جێیە، هاوارگەی جەرمەنە
(١٦) چاپی (م. ع): گڵی.
(١٧) چاپی (م. ع): لێی دە.

## کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە[*]

قەڵاتی کەرکووک لەجێی جەرمەنە[1]
نیشتەنی کۆنی خێڵی کرمەنە
لە پشت و نەوەی کوردی گەورەنە
زوانی ئێستەی فەیلی و لورِەنە
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە[2]
دڵ سووتاویانە، هەرچی کورد هەنە

***

(نەمرد)ی[3] ئەووەل[4] بینای کردووە
بەر لە بابل تیا حوکمی کردووە
لەپێش نووح بۆ گەل دەستووری کردووە
زانای[5] ستارەی کەشف کردووە
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[6]

***

دوو ساڵ کەیکاوس لە ناوی دانیشت
ناو شاری ڕێکخست بەکونج و بەخشت

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە. ب/٢ - ل/٤٦، ٤٧، ٤٨.
(١) جەرمەن: ناوچەی پەیدابوونی ئەڵمان.
(٢) ئەلزاس و لۆرەن (لۆرین): ناوی دوو هەرێمی خۆرهەڵاتی فەرەنسان.
(٣) واتە: نەمردوود.
(٤) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (ئەووەل) دواتر کراوەتە (بەرێ).
(٥) چاپی (م. ع): عیلمی.
(٦) ئەم کۆپلەیە لە چاپی (م. ع)یدا کۆپلەی چوارەمە.



دەوری ئاوا کرد بەباغ و بەکشت
ناوی نا (کەی کورد) ئینجا لێی ڕۆیشت
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[7]

***

سەرلەنوێ تازەی کرد دارای گەورە
شوورەی لێ کێشا دەورە بەدەورە
کوردی (ئەستەخری) هێنایە ئەورە
ئاتەشگەدەکەی ئێستاش وەک کەورە
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[8]

***

دوای جەنگیز، گرتی باوە ئەردەلان
حوکمداریی خۆی تیایا[9] دامەزران
بەناوی خۆی سکەی لێداو لێی چووان
لە خوتبەی جومعە ناوی خووندران
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[10]

***

(٧) لە چاپی (م. ع)یدا: کۆپلەی پێنجەمە.
(٨) چاپی (م. ع) ئەمە کۆپلەی دووەمە.
(٩) چاپی (م. ع): تیا.
(١٠) چاپی (م. ع): ئەمە کۆپلەی شەشەمە.

لێ وەرگیراوی ئەم تەئریخانە
(تەبەری) و ئاساری (هۆریتی) یانە[١١]
ساڵنامەی سێ سەدە و دەیی تورکانە[١٢]
کتێبی[١٣] دکتۆر (فریجی) ئەڵمانە
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[١٤]

***

لەسەر زووانا هەڵبەستی سووکە
ڕۆژهەڵاتییی، لاوی کەرکووکە
بۆ لە چاپدانی (ئەسیری) زووکە
ئەمە زەبووری گەورە و بچووکە
کەرکووک ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە

***

(١١) چاپی (م. ع): هەروتیانە.
(١٢) چاپی (م. ع): سێ سەدەی تورکانە.
(١٣) لە دەستنووسدا پێشتر نووسراوە (کتێبی)، دواتر کراوەتە (تەئریخی).
(١٤) لە چاپی (م. ع)دا ئەمە کۆپلەی سێیەمە.



## ڕۆژهەڵاتی نیشتمان

ئەم نیشتمانە گوڵشەنە شیرین و ڕەنگینە
پێویستە، نرخی نییە و مایەیی ژینە
باغی بەهەشتە بەگوڵزار و ئاوی کەوسەری
مێرگە لە پێچەوانەی ئەمە ئاسمانی شینە
لالە و گوڵ و وەنەوشە و ڕەیحان و سونبولی
وەک زوڵفی خاوی وەوی چین لەسەر چینە
یەزدان بڵندە، لە دووی ئەو پەرستشی
ئەم خاکی نیشتمانە لە بۆ لاوی کورد دینە
بەزیندوویی بۆ ژین، بەمردوویی بۆ گۆڕ
پێویستە بۆ بەهیشکی بۆ ئێمە ئاییینە
گشت لاو و ساوەیی قۆچاغی پەسەندی گەل
کوشتە لە دەوری ئەم ڕەزە فەڕینە پەرژینە
هاوتایی نرخی نیشتمانت ئەسیری نییە جیهان
پاساریی ئێمە لە جێیانی دیکە شاهینە

***

## میللییەت و وەتەنی

مـیللییـەت و وەتەنی ئەمـڕۆ چاوەکـەم باوە
پیـاوی وڵاتی دڵی بۆ وەتەن وەکـو قـاوە
ئەمـڕۆ ئەدوێ لە داغی وڵاتی لە مـاتەمـە
نوقـمی خـەیاڵە مـاتە پەرێشـان بووە لاوە
ئەوەی کـە پیـر و گـەورەیە، هەندێ جلخـوارە[1]
هەندێکیش خـەریکی بەزم گـرتنە و ڕاوە
هەر چیت هەیە لە ڕێی وڵات و گەل و کۆمەڵت
خەرجی بکە، کـە بمری بەشت چەن گـەزێ جاوە
هەر چەن بخـۆی و بنۆشی و بپـۆشی بێ کـەڵکە
ئەوەی کـە کـەڵکی بێ پاش مـردنت برا ناوە
بێگانە چاکـە بکا پیـاوەتی لە گـەڵت
هیچ لێی ئەمین مـەبە ڕۆڵە ئەوە تەڵە و داوە
بۆ تورکی بێ وەفا[2] وەکو پەرژینی موڵکی بووی
ئێسـتـا بچـۆ بزانە لەوێنە کـەست مـاوە
جلخـواری[3] یا سـیـاسـەتی بەدبینە بیـری تۆ
گـەر کـوردی مـەردی برا بابدەوە واوە
گـەر تێبکۆشی بەتوندی لە کـاروکـردەی گـەل
بڵند ئەبی وەک باپیـرە گـەورەکـەت کـاوە

(١) پێشتر لە دەستنووسدا نووسراوە (جلخوارە) و دواتر کراوەتە (بەدخواهە).
(٢) پێشتر بەو جۆرە نووسراوە، دواتر کراوەتە: (بۆ کۆنە گەورەت... تاد).
(٣) دواتر کراوەتە (بەدخواهە).



ماڵ و سەرت فیداکە لە ڕێی میللەت و کەست
ڕۆحی ڕەوانی عـەزیزت برا بنێ لاوە
پیـاوی وڵاتی، گـەلی، کـۆمـەڵی ئەمـەیە
گـیـانی بدا لە ڕێی کـەسی وەک بادەیی ئاوە
پاروویی چەور و ئاسـوودەیی بۆ تۆ هیچ نییـە
گەر بیری وات بێ (ئەسیری) خەیاڵەکەت خاوە

***

## نوور ئاوا

لەو دەمەی هەر کە لات کردە ئەم لاوە
زیندەوەر هیچ نەما یەک بەسەر پاوە
لە برسکانی ڕەنگی ڕۆژی ڕوخسارت
ناوی دڵ بوو بەشاری نوور ئاوە
لە گەزەنگی هەتاوی تاوی دیدارت
ئاگری جیایی سینە کوژیاوە
دڵ نیشانەی بەهاری ڕووتی گرت
بۆیە نایێ لە چاوی من ئاوە
ژیری، هۆشەنگی هەر وەک ئەفلاتوون
هۆشی لای هێزی شۆخی تۆ ساوە
سەد هەزار مەردی گوردی وەک فەرهاد
بۆ شرینی ڕۆحت بەگەشکە تاساوە
هێزی دڵگیری ڕەنگ و ڕووی چارەت
چییە زانا لەوێ نەزان داماوە
تۆ لە کوێ وو من لە کوێ تۆ چی و من چی
خۆشەویستی ئەسەل هۆگری پیاوە
چییە یەک دەم لە من بەڕۆژ و شەو
گوم نی وو، دڵ لە دووری سووتاوە
خۆشەویستی نەبێ جیهان کپ و ناخۆشە
سوودی دڵدارییە زیندەوەر ماوە
شۆخی شیرینی من، مەڵێ (ئەسیری) پیرە
پیر بەدیداری مینەویت لاوە

***



## ستایشی مامۆستا بەشیر موشیر(*)

شاعیرێکمان لێ پەیا بوو تازە میللەت موژدەیە
بولبولی باغی گوڵە شمقاری(**) کێوو هەردەیە
چاوی پیاوانی گەلت ڕوون کرد، دڵان خۆشە بەتۆ
ئەی بەشیری خۆش خەبەر ئەم موژدەیە خۆش موژدەیە
ماوەت و تاقە بەدەست ئەبڕی، زمانیشت غەزەل[1]
پیریش هەروایە وەستا، مەردی کارو کردەیە
کار کەرو زانا کە تووشی دەردی گەل بن چەند خۆشە
کارکەریشمان خوا شوکوربێ موبتەلای ئەم دەردەیە
ئەی (ئەسیری) دەم بەدەم شاعیر لە میللەت زیاد ئەبێ
حاجی عەبدولقادری کۆیی وەلێ سەرکردەیە

(*) ئەم هەڵبەستە لەڕێی مامۆستا نەریمانەوە بەردەستمان کەوت، ئەویش لە ژمارە (١٠)ی سالّی (٣)ی ژیان وەریگرتووە کە لە ڕۆژی ١٩٢٨/٢/٢دا بڵاوکراوەتەوە.

(-) لە چاپی (م.ع) وەرگیراوە ب/١- ل/١١٦.

(**) شمقار: مەلێکی ڕاوکەرە لە باز بەهێزتر و جوانتر.

(١) مەبەس لە (ماوەت و تاقە) ئەو دوو جۆرە قوماشەیە کە لەو سەردەمەدا بۆ کەوا بەکارئەهێنرا و زۆربەی پیاوماقوڵان لەبەریان دەکرد، مامۆستا بەشیر موشیر بەرگدروو بووە لە کاتی خۆیدا بۆیە (ئەسیری) ئەڵێ ماوەت و تاقە بەدەست ئەبڕی.

## پێخوازی چاخی

گـەر ئەدیبی، ئارەزووی سـەرکـەوتنی کـوردت هەیە(*)
تەرکی بێژی[١] عیـشقبازی کە، ئەگەر[٢] بیرت هەیە
بێــژی تەئریخی بلێ بۆ ئاگــەداریی مــیللەتت[٣]
پەیڕەوی زانین و کــرداری بە، گــــەر هۆشت هـەیە[٤]
ناوی (هۆمـەر) چەند هەزار سـاڵە لە یۆنان هەر هەیە[٥]
بێژی[٦] تەئریخیی دەگوت، وەک ئەوبە گەر زەوقت هەیە
گـوفـتی[٧] بەد ئەخـلاقی و ناوی[٨] ئەدیبی چۆن ئەبێ
تەرکی گوفتی[٩] چاو و خاڵ و خەتکە، و یجدانت هەیە
تەرکی کـوردی و نەزمی تورکی و فـارسی چۆن مـروەتە؟
خۆت بەمە بێفەڕ[١٠] ئەکەی بنواڕە گەر[١١] بیرت هەیە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە – ب/١ – ل/٤٧ – ٤٨
هەروەها – ب/٢ – ل/٨٧ – ٨٨. بەناوونیشانی (ویجدانی عەسری)...
(١) چاپی (م. ع): ئەشعاری
(٢) چاپی (م. ع): کە گەر
(٣) چاپی (م. ع): شیعری تەئریخی بلێ بۆ ئینتیباهی میللەتت
(٤) چاپی (م. ع): مورشیدی عیلم و مەعاریف بە ئەگەر عەقڵت هەیە
(٥) چاپی (م. ع): باقییە.
(٦) چاپی (م. ع): شیعری
(٧) چاپی (م. ع): شیعری
(٨) چاپی (م. ع): لافی
(٩) چاپی (م. ع): باسی
(١٠) چاپی (م. ع): تەقبیح
(١١) چاپی (م. ع): تێ فێکرە کەر



خـاوەنی بڕوای[١٢] پاکی و، ئەهلی ئینسـافی ئەگـەر
نابێ مـەنعی کەی لە خزمت، هەرچی سەرمایەت هەیە[١٣]
خۆت فیدای ڕێی میللەتت کەی، گەرچی گیانت دەرئەچێ[١٤]
شـوورەتت باقی دەبێ، تاخـاکی سـەر گـۆڕت هەیە[١٥]
بیـست ملیـۆن کـوردی لەو ڕۆژی چلۆن بێ خـاوەنە[١٦]
بۆ حـەقـیـقـەتیـان بەرە، گـەر توانا و زانینت هەیە[١٧]
چەن عـەتیـقـەی پێـشی کلدانی لەجـێی تۆ کـەوتووە
خـۆ نەزانی تاکـو کەی؟ ئینسـانی تۆش مـەغزت هەیە
چاوەنۆڕە گـیـانیـان بێ شـوبهـە بۆ ڕزگـاریی تۆ[١٨]
شـەهـ سەلاحـەددین و حاجی، چەند کـەریم خانت هەیە
خـوارە ئەو پیـاوە، کـە هەر تەدبیـری نانی خـۆی ئەکـا
بۆ ژیـانی مـــیللەتت بێ، هەرچی کـــردارت هـەیە
پەت بەمل گەر بچیە سەر کورسی لە ڕێگەی میللەتت
شـاهی سـەر تەختی، خـەزینە و گـەنج و سامـانت هەیە[١٩]
گـەر بشـێلی ئەی (ئەسـیری) فـەوجی کـوردی کـوڕی تۆ[٢٠]
وا مـەزانە گـۆڕە جـێگەت، باغی عـەدنانت هەیە[٢١]

(١٢) چاپی (م. ع): ساحیبی ویجدانی
(١٣) چاپی (م. ع): نابێ مەنعی کەی لە قەومت چەندە تۆ حاڵت هەیە
(١٤) چاپی (م. ع): خۆت فیدایی ڕێی میللەتت کە گەرچی جیسمت مەحوە بێ
(١٥) چاپی (م. ع): شوهرەتت باقی ئەبێ تا خاکی سەر قەبرت هەیە
(١٦) چاپی (م. ع): پانزە ملیۆن کورد لەم ڕۆژە عەجەب بێ ساحیبە؟!
(١٧) چاپی (م. ع): ......... گەر قودرەت و عیلمت هەیە
(١٨) چاپی (م. ع): مونتەزیرە ڕوحیان بێ شوبهە بۆ ئیفلاحی تۆ
(١٩) ئەم دوو دێڕە شیعرەی سەرەوە (چوار نیوە دێڕ) لە چاپی (م. ع)یدا نییە.
(٢٠) چاپی (م. ع) لەجیاتی (کوڕی تۆ)، (قوربەسەر).
(٢١) چاپی (م. ع): گەرچی مەدفونی لە خاکا قەسری عەدنانت هەیە.

## جلخواری و ملخواری[*]

چەند پێم وت کوڕە وازبێنە لەم جلخوارییە؟
ئاخرو ئەنجامی جلخواری وەها ملخوارییە
ئەو نەخۆشەی دائیما دەتگوت زەریفە سیحەتی
ڕۆژی ئەووەڵ پێم گوتی باوەڕکە دەردی کارییە
دەست و پێی خۆت بەستەوە تا بووی پەرێشان و ڕەزیل
فائیدەت چی بوو بڵێ توخوا ئا لەم ئینکارییە
دۆتەکەت وا لێبراوە بۆیە هێندە موفریتە
کابراش دەیەوێت و نایدەن، بۆیە وا هاوارییە
دەردی لوقمەی چەورە عالەم گوبە و شێت و هار ئەکا
کەس نییە بۆ دینی بێ ئەم قال و قیلە و زارییە
ئەو کەسەی مەیلی دەکەی گوایە بەناوی دینەوە
وا لەسەر شەپقە لە بەینی میللەتت کوشتارییە
خۆتش ئەیزانی حەقیقەت وایە ئەمما پێوەبووی[1]
لات وەهایە تازە عەیبە تەرکی ئەم بێعارییە
سەیری کوردی میللەتت کە چەند جاهیل مایەوە
سەنعەت و کەسبێ کە هەیبێ شوانییە و جوتیارییە
ئەی "ئەسیری" لێیگەڕێ جل خوارە دەردی خۆی بەسە
ئەم غەم و دەردەی کە هەشیە، ڕاستی سەربارییە

(*) زاری کرمانجی ژمارە (٤) ساڵی یەکەم لاپەڕە (١٦).
لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/ ٢- ل/٦٤
(١) خۆتش: بەشێوەی ئاخاوتنی کەرکووک واتە خۆشت.



## کاسەی پڕ لە خوێن

دڵ سەبووریت بۆ نییە، ئارام و وێستانت نییە
ڕێگەیی یارت نییە، هیوایی دڵدارت نییە
هەر وەکو کەو بەندی داوی، یا لەژێر پەنجەی هەڵۆی
مردنت دیوە بەچاوت، ڕێیی ڕزگارت نییە
تووشی شەهبازێ بووی، توانایی نەزدیکیت نییە
بۆ ئەفرازیشت لە سەودایی ڕوخی چارەت نییە
بۆچی توند و تەنگ و تاریک و پەشێو و ئاتەشی
ئەی دڵی پڕ دەردی من، یاری شەدەلارت نییە
بۆ وەکو بۆتەی لە کوورە ئاتەشین و پڕ گڕی
هەڵبەتە تاکی وێرانەی، توڕڕە تاتارت نییە
چونکە پڕ دەردی لە دەردا، بووی بەکاسەی پڕ لە خوێن
دیارە یاری خۆشەویستی، کوڵمی گوڵنارت نییە
هۆ (ئەسیری) چونکە تۆش نوقمی لە دەریایی غەما
دیارە ساقی و موتریب و دەنگی نەی و تارت نییە

***

## مەیلی ژاپە

مەیلی ژاپەم هەیە ئێرانە هەوای چاکی نییە
پیاوی ئەم جێگەیە زانستن و ئیدراکی نییە
عەیش و نۆشێکم ئەوێ بێ کەدەرو بێ غوسسەبێ
گۆی زەوی ڕاستت ئەوێ بێ قڕە خۆراکی نییە
بچمە گۆڕەوە زۆر چاترە لەم زندەگییەم
بەس نییە مردوو لە گۆڕا لە کەسێ باکی نییە
وام ئەوێ هیچ کەسی گەل ملکەچی هیچ پیاوێ نەبێ
لام وەهایە[1] گەلی وا ئەمڕۆ لە هیچ خاکێ نییە
لە غەمی گەل لەشی ڕەنجیدەیی من کەڵکی نەما
دەفڕێ ڕووح[2] لەلانەی هەوەسی لاکی نییە
چونکە پێک نایێ وەها زوو بەزوو هیوایی دڵم
تێ دەنۆڕم کە لە هیچ لایەوە ڕووناکی نییە
سووم دەبێ کورکی لەبەر، لاستیکی بێگانە لەپێ
هێندە کوردی لە بەفر پەستەک و کالاکی نییە
چوار سەد ساڵ بوو بەبێگانە چ خەرجێکت ئەدا
ڕۆژێ ئێستا کە هەزارت دەکوژێ باکی نییە

(١) لە دەستنووسدا پێشتر نووسراوە (لام وەهایە) دواتر ئەوە خەتی بەسەردا کێشراوە و نیوە دێڕەکە بووەتە:

گەلی وا (ڕاستت ئەوێ) ئەمڕۆ لە هیچ خاکی نییە

(٢) دواتر کراوەتە: گیان.



ئەو کەسەی بیری هەبێ پڕ دڵی قەهر و دەردە
بەشەق و بار و کوتەک هەر کەرە غەمناکی نییە
کەسێ هێشکچییەتی[3] بۆ گەل و نیشتمانی نەبێ
بەخودا هێشکی بۆ خوشک و ژن و داکی نییە
بەسە ئەم دەرد و غەمە مەمرە (ئەسیری) دەبژی
هۆشیاربۆتەوە گەل، هیچ مەڵێ ئیدراکی نییە

***

(٣) هێشکچییەتی: ئێشکچییەتی.

# چوونە مەلاس

تووشی دەردێکم لە هیچ دەرمانگە دەرمانی نییە[*]
دڵ پەرۆشێکی هەیە، ئارام و وێستانی نییە
گورگە بۆز و، گورگەشین و، گورگە ڕەش چوونە مەلاس
مێگەلی کوردی لە شیوو هەردەیە، شوانی نییە
نەونەمامی باغی خۆشیی نیشتمانم هاتە بەر[1]
باغەوان و پاسەوان و ئاو و کێلانی نییە
قەیرەیی گەل نووستووە، بێهۆشە وەک وافوورکێش
یا نەخۆ وەک مردووە، جوولان و هەڵسانی نییە
لاوی من بیستوومە وا تازە فریبت خواردووە
هۆ، نەکەی ئیشی وەها، جلشۆڕە، پەیمانی نییە
کابرای جلشۆڕ لە بۆ توو ڕێک ئەخا سەد حیزە فێڵ
تۆکە بینینت نییە، ئەو هۆشی پیاوانی نییە[2]
وا لە دڵمایە لەسەر تەپڵی سەرت دەم مێکوتێ[3]
لەو دەمە گیانت دەرێ[4]، بەو خوایە هاوشانی نییە
خۆم دەڵێم هەڵدەم لە هەڵدێرێکەوە بشکێ ملم
وا نەبێ[5] کەللەم لە خۆداری تۆ وەرسانی نییە

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/٢ - ل/٣٣ - ٣٤.
(١) چاپی (م. ع): نیشتیمانی من هاتۆتە بەر.
(٢) لە چاپی (م. ع): ئەم دێڕە و دێڕی دوایی دوای ئەم پاش و پێش خراون.
- تۆکە: لە دەستنووسدا (تۆ تە)یە.
(٣) چاپی (م. ع): ... سەرت دەمی مێکوتێک.
(٤) چاپی (م. ع): دەربێ...
(٥) چاپی (م. ع): واتە بێ کەللەم...



بچمە ژووری توونەیی سەر شۆرکی، ببمە زوخاڵ[6]
بینێژن زانا بڵێ[7]، هیچ کەڵکی شۆرانی نییە
خۆم دەڵێم هەڵدەم بۆ دەریاییێکی، یازێیەکی قووڵ[8]
دابخنکێم[9]، وا نەبێ ئەم ڕەنجە پایانی نییە
با لەسەر جەرگ و دڵی خۆم دەم بەتوندی خەنجەرێ
تازووە گیانم دەرێ، ئەم مانە هیچ مانی نییە[10]
بۆیە تێبینی ئەکەم خۆم چۆن لە ناو دەم چاترە
یەک لە (ساوە) و (لاو)و (قەیرە)و(پیری) جوولانی نییە
هەر دەبێ بمری لە داخی[11] نیشتمان و گەل، ئەتۆ
تووشی دەردێکی (ئەسیری) چار و دەرمانی نییە

(٦) ئەم نیوە دێڕە لە چاپی (م. ع)دا نییە...
(٧) چاپی (م. ع): بمنێژن زانا بڵێن...
(٨) چاپی (م. ع):
بچمە ناو دەریایێ یا زێ یەک ژێری نەبێ
(٩) چاپی (م. ع): وا بخنکێم...
(١٠) پێشتر لە دەستنووسدا (بەهەڵە) نووسراوە (ئەم ڕەنجە پایانی نییە) کە دووبارەی دێڕی پێشووە، دواتر ڕاست کراوەتەوە.
(١١) چاپی (م. ع): دەردی.

ی

## داء الميلله

خـــەڵکی خـــۆرئاوا بزانی چی ئەزانن ورِ ئەبی[*]
گەشتی شار و کارخانە و کردەیان کەی، سڕ ئەبی
سەیری وێرانە و کەلاوەی خاکی کوردستان بکەی
تێدەگەی حاڵی گەلت، ئەوجا لە داخا مڕ ئەبی[۱]
بۆچی وەک گەل گەل، تۆ نابی هۆگری پیاوی گەلت
وا لەبەر چیتە پەشێو و هەر لەیەک بڕ بڕ ئەبی
تا لەسەر ئەم بیرە بی، وا بێ ڕەوشت و کردەوەت
هەر وەها مات و پەشێو و، ملکەچ و جل شڕ ئەبی
دوژمنی گەورەی خۆتی، بۆ مەردمی دی نۆکەری
ئاخر و ئەنجامی تۆ کوردە، بزانە قڕ ئەبی
لاوی کوردی من، نەمامی نەورەسیدەی میللەتی
وەک پێشوونانت بجووڵێی، دیارە تۆشم زڕ ئەبی
ئەی (ئەسیری) تووشی دەردێ بوویتە (دائولمیلله)یە[۲]
ناگەڕێ زارت هەتا دەمری، لە گۆڕا کڕ ئەبی

***

(*) ئەم شیعرە لە چاپی (م. ع)یشدا هەیە - ب/۲ - ل/۵۵.
(۱) ئەم دێرە شیعرە و ئەوەی دوای ئەم لە چاپی (م. ع)دا پاش و پێش کراون.
(۲) لە دەستنووسدا: (داء الملە).



## هۆنراوە[*]

ڕۆڵە مەربووتی خەلافەت بە، خەلیفەی عەرەبی
لە سولالەی عەلی-یە ڕەبتی ڕەسووله نەسەبی
بەهەموو مەزهەبێ مەقبووڵە ئیمامی حەقە
لە کەماڵە حەسەبی، هەم نەسەبی، هەم ئەدەبی
ئەوە ئیمرۆکە ڕەئیسی هەموو ئیسلامی جیهان
هەموو ئیسلامی جیهان هەر بەوە شان و شەرەفی
بەیعەتی لازمە بێ شوبهە حوسەین ئیبنی عەلی
ساکنی ماڵی خودایە، دوژمنی دینە هەدەفی[۱]
ئەوە بوهتانە دەڵێن لەشکری ئیسلامی شکان
گوایە لەو لەشکرە سەرکردە بوو فەیسەڵی خەڵەفی
ئەوە تەئدیبی کەسێ بوو کە لە خوا عاسی بوو
کوردی ئەو بێ ئەدەبە غارەتی ئەموالی نەبی
چ ئەزاییێکی بەهەم سایەی پێغەمبەر کرد
سەبەبێکی نەبوو ئەو ئیشە، مەگەر بێ ئەدەبی

(*) لە دەسنووسێکی لای خۆمانەوە وەرگیراوە، ئەم هۆنراوە بۆ پاڵپشتی شۆڕشی دژی دەوڵەتی تورکەکان وتراوە. کە لەو کاتەدا دەستیان بەسەر هەموو وڵاتی ئیسلامدا گرتووە، کوردستانیش بەشێک بوو لەو دەوڵەتە. لێرەدا وا دیارە "ئەسیری" لەسەر وتەی کورد کە ئەڵێ: (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) ئەم شیعرەی هەڵبەستووە بۆ پشتگیریی شۆڕش (شەریف حسێن) لە مەککە.
لە چاپی (م.ع)یەوە وەرگیراوە ب/ ۲- ل/ ۵۹- ۶۰.
(۱) حوسەین ئیبنی عەلی: شاه حسینی شەریفی مەککەیە کە شۆڕشی دژی دەوڵەتی تورکەکان هەڵگیرساند.

چووە ڕەوزەی نەبەوی ئەو قسەیەی کردی جەمال[٢]
بیبیێ هەرچی کەس هەڵدە چێ بەحری غەزەبی[٣]
ئەوە شەیتانە، دەجووڵێ لە عەلیهی شورەفا
لەعنەتی خوای چووە سەر، کەم نەبوو ئادەم شەرەفی
تەلعەت و ئەنوەر و جاوید، جەماڵ جاهید
تەفرەقەی عونسوری ئیسلام ئەمان بوون سەبەبی
ئەی "ئەسیری" باغیزانی شورەفا هەر خەجەلن
گەر بەریبن لە شەفاعەت نییە ڕاستی عەجەبی

(٢) جەمال: مەبەس لە سەرکردەی لەشکری تورکەکانە کە چووبووە سەر حجاز.
(٣) بیبیێ: گوێی لێ بێ ببیسێ.



## ئای دەم ئادەم

بۆچی ئەمەندە سەرکز و شێواو و عاجز و سستی
داماو و زەرد و خەفەتبار و وسکت و پەستی
دەردێکی کاریی دەروونیت هەیە وەها گرژی
یانە خوماری دووکەڵی وافوور بووی مەستی
ئەی ڕۆڵە ئاهی گرینت گۆوای دەردی دڵە
چارەی بەگۆشەنشینی نییە دەبێ هەستی
ئاری نەوەی گەلی میدیایی شاهی کەی ئەخسار
پێ لەشکری ئەوی بۆ هەموو گۆی زەوی پەستی
چاخی لە ئاسی ئاری بەهێز و جیهان گیر بوو
ئێستا لە ئاری پاوە لەسەر دەستی عالەمە دەستی
هەر بابەتێکی ئەم گەلە دەورێکی ژووری زوو دیوە
بەخشی خوایە بۆیان حوکمڕان و سەربەستی
ئادەم لە داخی کاری دەمی دیگوت؛ ئای دەم دەم
ئەوسا لە باغی عەدنەوە بۆ کێوی هیند خوا خستی
ڕۆڵانی لێیەوە فێربوون پێیان دەگوت ئادەم
بۆی بوو بە ناو پێی خۆشبوو کە خۆشی دەیبیستی
پێشین زوانی مەردومە گوفتی شرین و نازکی تۆ
لە بڵمە بڵمەوە بوو بۆ گەلان زوانی پێویستی
زۆر ژووری، زۆر بڵندی، یەکە ڕۆڵەیی نووحی
بۆیە لە دەوری جوودی نەڕۆیی گەلت لەوی ویستی
گوفتی شیرین و ڕێکی (ئەسیری) لەبەر بکە ڕۆڵە
تاریکی میللەتە هۆشەنگە بێژ و هەڵبەستی

